یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

لە کوردستاندا

48

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی چوارەم - ئایاری ٢٠١٢



## با لە ساڵیادی لەدایکبوونی (بڕیار)دا بڕیار بدەین!



مرۆڤی ژیر
ئەو کەسەیە کە بەلەمێک
دروستدەکات
بۆئەوەی لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوە،
نەک بە دەوری خۆیدا دیوار
دروست بکات
تا خۆی لە لافاوەکەی بپارێزێت..
RASAN
Group
ئەم لاپەڕەیە بە سپۆنسەری
گروپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن بڵاو دەکرێتەوە

The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

NO. 48

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی چوارەم - ژمارە 48 - ئایاری 2012



**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار: مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

هاژە شێروانی
پەیمان بەرزنجی
محەممەد مێرگەیی
محمد هاشم محمد

پەری شێخ کەریم
بێگەرد فارس
وەهاب حەسیب
ئەسکەندەر ڕەحیم



5



10

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین



12

**بەشی هونەری و دیزاین**

قەیدار ڕەحیم

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی سێیەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢
هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠
E-mail: bryarmagazin@gmail.com



14

دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك
٣٢٠٤٠٩٦ - ٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠

بەشی ڕیکلام
07480112787

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار

# با لە ساڵیادی لەدایکبوونی (بڕیار)دا بڕیار بدەین!

چوار ساڵە، بێ وچان، (بڕیار) پەیڤی ڕازاوەو بیرۆکەی جوان، دەستەگوڵی هەمیشەیی دەستێنێ.

(٤٨) ژمارە لە شەونخوونیو ماندووبوون، لە خۆشەویستیو وەفاو ئەوینو دڵسۆزیو میهرەبانی.

(بڕیار)، ئەو هاودەمو هاوڕازە هێمنو ئارامەی، بە هەستێکی ناسکو دڵێکی نەرمو چاوێکی شەرمنەوە، ئاوێتەی ڕۆحتان دەبێتو بە جوانی ئامۆژگاریتان دەکات، دەستی لە نێو دەستی ئێوە ناوەو بەرەو ئاسۆی بڵندیو ژووانی نورو ڕووناکیتان دەبات!

چونکە بڕیار میدیای نوورە، نەك میدیای سێبەر!

ئێمە لە بڕیاردا لەبەرهەتاوو بە تیشکی خۆرو تریفەی مانگەشەو دەنووسین، لامان وایە ئەگەر کتومت بە شوێنەواری کەسانێکدا بڕۆین، ئەوا هەرگیز شوێنەوار بۆ خۆمان بەجێناهێڵین.

بڕیار، ئاسۆیەکی ڕوونی هیوای ئاواتو ئامانج بەرزە، لە فەرهەنگی بڕیاردا ڕەشبینیو بێهیوایی بوونی نییە.

لە بڕیاردا مرۆڤەکان گەورەترین بوونەوەرن، سەرچاوەی ژیارو شارستانییەتو پێشکەوتنو داهێنانن!

بڕیار، کارگەیە، کۆمپانیایە، پڕۆژەیەکی گەورە، بەڵام بۆ دروستکردنو بنیاتنانو نۆژەنکردنەوەی مرۆڤەکان!!

بڕیار، ژووانی دیداری دڵەسپییەکانو چاوەگەشەکانو لێوەخەندەبەخشەکانو دەستەڕەنگینەکانو مێشکە پڕ لە بیرۆکەکانە!

بڕیار، موڵکی ئەو کەسانەیە کە خۆشیان دەوێت، خۆیان خۆشدەوێت، وڵاتەکەیان خۆشدەوێت، مرۆڤەکانیان خۆشدەوێت، پەیامی ئاشتیو خۆشەویستیو میهرەبانیو ئاکاری بەرزو بەهای بڵند بڵاودەکەنەوە!

بۆچی لەم کاروانە شکۆدارە، دوابکەوین؟! بۆ دەستناخەیتە نێو دەستی سەربازانی نەناسراوی بڕیارو بۆ بەدیهاتنی ئامانجە گەورەکانت هەنگاو نانێیت!

بۆ نایەیت چێژ لە ماندووبوونی ڕاستەقینە وەربگریت، بۆ نایەیت شادمانی هەمیشەیی بنۆشیت، بۆ نایەیت بە یەکەوە فرمێسکەکان بسڕین، خەندە بگێڕینەوە بۆ لێوەکان، هیواو ئومێد ببەخشین بە دڵەکان.

دەبا لە داگیرساندنی پێنجەمین مۆمی تەمەنی پڕ فەڕو بەرەکەتی بڕیاردا، ببینە خاوەنی بڕیاری خۆمان!

چونکە بڕیار، لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا تێدەکۆشێت!

# کارگێڕی بە گوفتار

دڵسۆزی ٧ / ١٠ی سەرکەوتنە لە کاردا.

جیمس بارکۆن

ئێمە پێویستمان بە زانینی زۆر نییە،
هێندەی پێویستمان بە ڕەوشتی بەرزە.

سەعد زەغلول

ئەدیب لە ڕۆژهەڵاتدا، بە زیندویی دەمرێو بە مردویی دەژی.

جمال الدینی ئەفغانی

ئەو مرۆڤەی ویستی خۆی بە یاسا بزانێت، دەبێتە مرۆڤێکی بێ یاسا.

شکسپیر

مرۆڤی ڕژد، دزی لە خۆی دەکات، دەستبڵاویش لە میراتگرەکانی.

توماس فولر

هەمیشە لە دووژمنەکانت ببورە، چونکە هیچ شتێك
هێندەی ئەوە نیگەرانیان ناکات.

ئوسکار وایلد



## کارگێڕی بە چیرۆك

# شاری بەرژەوەندییەکان

لە یەکێك لە ڕێگە سەرەکییەکانی دەرەوەدا پێچو لاڕێیەکی ترسناك هەبوو، کە هەمیشە دەبووە مایەی ڕووداوو کارەساتی سەخت بۆ ئۆتۆمبێلەکان، بەتایبەت لە کاتی سوڕانەوەی خێراو بێئاگایی لە گۆشەی سوڕانەوەی پێچاوپێچی ڕێگاکە.

ڕۆژێکیان کابرایەکی زیرەك هاتو ئەم دیاردەیەی خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە.

لە ئەنجامدا؛ وای بە خەیاڵداهات کە وەرشەیەك نزیك بەم لاڕێیە دروستبکات، بۆ چاکردنەوەی ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە بە هۆی ڕووداوی جۆربەجۆری ئەم ڕێگایەوە زیانیان بەردەکەوێت!

پاش چەند ڕۆژێك وەرشەکەی پڕ بوو لە ئۆتۆمبێل، بە هۆی ڕووداوە یەك لەدوای یەکەکانی ئەو ڕێگایەوە، بەڵام هاوڕێ بە خراپبوونی ئۆتۆمبێلەکان بریندارەکان پێویستیان بە نەخۆشخانە هەیە، بۆ چارەسەرکردنیان، کەسانێکی تر لە شۆفێرانو ڕێبوارانو کەسانی تر، پێویستیان بە چێشتخانە هەیە!

شۆفێرەکان بۆ شوێنی پشوو پێویستیان بە گازینۆو چایخانە هەیە، هەندێکیش ناچاردەبن شەو لەوێ بمێننەوە، کەواتە پێویستیان بە میوانخانەیە، بوونی میوانخانەیەك شتێکی زۆر پێویستە!

هەربۆیە لە کاتێکی کەمدا لەو شوێنەدا شارێکی سەرسوڕهێنەر پەیدابوو، کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەورەبووندا بوو، دانیشتوانی هەمیشە تەماشای ئەو (پێچەی ڕێگا)یان دەکرد، بە گەنجینەی ئاڵتوونییان دەزانی، بەڵکو هەندێك دەیانگوت؛ ئەم ڕێگایە وەکو بیرەنەوتێك وەهایە بۆ ئێمە!

لەم نێوانەشدا یەکێك گوتی؛ بەڵام ئەم شارەی ئێمە پێویستی بە شارەوانیو سەرۆکی شارەوانی هەیە، دوای ئەم پێشنیارە سەرۆکی شارەوانی دیاری کرا.

ڕۆژێکیان نێردراوێکی حکومەت، بیرۆکەی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی کردو داوای ڕاستکردنەوەی ڕێگاکەی کرد، چونکە بە مەترسییەکی گەورەی دانا، لە ڕێگای گەشتیاراندا!

بەڵام دەزانن چی ڕوویدا؟

ئەم بیرۆکەیە بوو بە مایەی خۆپیشاندانو نارەزایی دەربڕین، چونکە ئەم کارەیان بە هەڕەشە لەسەر ئایندەی شارەکە دەزانیو دەزگاو دامەزراوەکانی دەخستە مەترسییەوە!!

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:**

١- پێویستە چارەسەری کێشەکان بکەین، پێش ئەوەی پەرەبسێنێتو بەربەست بێتە بەرامبەر چارەسەرکردنی.

٢- دەبێت بزانین بەردەوام کەسانێکی هەلپەرست هەن، کە سوود لە گرفتەکان وەردەگرنو لە ئاوی لێڵدا مەلە دەکەن!

٣- زۆرجار بەڵای هەندێك بۆ هەندێکی تر، مایەی سوودمەندییە، وەکو متنبی شاعیر دەڵێت:

(كذا قضت الأيام ما بين أهلها - مصائب قوم عند قوم فوائد).

٤- کەسانی خۆپەرستو تەماعکار، چاویان تەنها بەرژەوەندی خۆیان دەبینیو ئەگەر خۆیان سوودمەندبن، ئیتر زەرەرو زیانی خەڵکیان بە خەیاڵدا نایات.

٥- سیستەمی سەرمایەداری هاوچەرخ، هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتی بەرچاوناگرێو بۆ کەڵەکەکردنی پارەو کۆکردنەوەی سەروەتو سامان، هەموو ڕێگایەك دەگرێتەبەر.

٦- هەر کاتێك مرۆڤەکان هەستی مرۆڤانەو سۆزو بەزەییان فەرامۆشکردو باوەشیان بە دونیای تەماعدا کرد، ئەوا کارەساتی گەورە ڕوودەداتو مەترسی گەورە ڕوویان تێدەکات.

٧- با لەبەر بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆمان، زیانی گەورە بە بەرژەوەندی گشتی نەگەیەنینو لە پێناوی ماددەدا سەروماڵی سەدان کەس نەخەینە مەترسییەوە، چونکە وەها ڕەفتارێك مرۆڤ لە هەموو سیمایەکی مرۆڤانە دادەڕنێ..

# تەنها بۆ سەرکردەکان

## ئەگەر ناتەوێت سەرکردەبیت، ئەم لاپەڕەیە مەخوێنەرەوە!

من تەنها ڕاهێنەرم.

لویس نەرزوبی

خەڵکی هەموو دەزانن چۆن دەجەنگم، بەڵام نازانن چۆن پلان بۆ سەرکەوتن دادەنێم.

سەرکردەی چینی (سەن تسۆ)

سەرچاوەی نوێی هێز، بوونی سەروەتو سامان نییە، لای کەسانێکی کەم، بەڵکو هەبوونی زانیاری بە دەستی زۆرینەوە.

جۆن نایبست

ئەو کەسەی کە هەرگیز پرسیار ناکات، یان هەموو شتێك دەزانێت، یاخود هیچ نازانێت.

مالکوم مۆریز

سەرکەوتووەکان دەزانن بۆ کوێ دەچن، چۆن پلان دادەنێن؟ کێ هاوڕێیەتییان دەکات لە گەشتەکەیاندا.

دینس دیتلی

کلیلی سەرکردایەتی سەرکەوتوو، توانای کاریگەرییە، نەك دەسەڵات.

کینیپ بلانشارد

و: ڕەهبەر مەسعود

# ١٠٠ ئاماژە لە ژیانو بەڕێوەبردندا



بەشی چوارەم

**٣٨- کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ:**

بەپێی توانا هەوڵبدە خۆت واز لەو خووە بهێنیت، لەوەی کە کاری ئەمڕۆ بخەیتە سبەینێ؟! تاوەکو لە لایەنی دەروونییەوە هەست بە ئاسوودەیی زیاتر بکەیت، هەروەها لە لایەنی جەستەییشەوە هەست بە پشوو بکەیت، چونکە دوانەخستنی کارەکانت کاریگەری دەبێت لەسەر ئەنجامەکانتو بەرهەمی ڕۆژانەشت زیاد دەکات، بەردەوام ئەم وتە جوانە بەبیرخۆت بهێنەرەوە کە دەڵێت: کاربکە بۆ ژیانی دونیات، وەك ئەوەی تاهەتایە دەژیت، کاربکە بۆ ڕۆژی دوایت، وەك ئەوەی سبەینێ دەمریت.

**٣٩- هیچ شتێك لە نەرمی بەهێز تر نییە:**

ئاو لەگەڵ نەرمیو شلییەکەی بەردی گەورە دەڕوشێنێ، یابانییەکان دەڵێن: هیچ شتێك لە نەرمی بەهێزتر نییە. ئەگەر دەتەوێت بگەیتە ئامانجەکانتو ئەو شتانەی دەتەوێت بەدەستی بهێنیت، ئەوا نەرمی بەکاربهێنە بەشێوەیەکی چاكو مامەڵەیەکی باش، ئەوەی کە دەتەوێت بە پەڕگیری (توندڕەوی) دەستەبەری بکەیت، ئەوا بە نەرمونیانی چاکتر بەدەستدەهێنرێت.

**٤٠- وەك ئەدیسۆن بە:**

ئەو کاتەی ئەدیسۆن خەریکی تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە تایبەتییەکانی بوو لە تاقیگەکەیدا، یەکێك لە یارمەتیدەرەکانی پێی گوت: تۆ پاش ئەوەی (١٠٠) تاقیکردنەوەت ئەنجامدا، بەڵام لە هەر هەمووی شکستت هێنا، ئێستا بۆ وازناهێنیو ئەو بەردەوامییەت سوودی چییە؟ لە وەڵامدا ئەدیسۆن گوتی: سوودەکەی ئەوەیە کە ئێمە (١٠٠) ڕێگامان تاقیکردەوە، زانیمان بەو سەد ڕێگایە ناگەینە ئامانج.

ئەگەر بەردەوامیو هەوڵەکانی ئەدیسۆن نەبوایە، ئێستاش ژیانمان، هەر لە شەوەزەنگی تاریکی بەسەر دەبرد، چونکە ئەو لە کۆتاییەکەی گڵۆپی کارەبایی دۆزییەوە، تۆش لە هەوڵدانی بەردەوام بێزار مەبە، چونکە بێگومان هەر دەگەیت بە ئامانجەکانت.

**٤١- ئەوەی هیچی پێ نەبێت، هیچیشی پێنابەخشرێت:**

یاسایەکی زێڕین هەیە دەڵێت: بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە، کە پێتخۆشە، ئەوانیش بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵدا بکەن، وا بیرمەکەوە کە تۆ بە خراپی مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکەیت، ئەوانیش بە چاکی مامەڵەت لەگەڵدا بکەن، وا بیرمەکەوە کە تۆ ڕێزیان ناگریتو ئەوانیش ڕێزت دەگرن، وا بیرمەکەوە کە تۆ دەموچاو گرژیت لەگەڵیان، ئەوانیش زەردەخەنەت لە بەرامبەر دەکەن!!

چونکە ئەوەی هیچی لا نەبێت، هیچیشی پێنابەخشرێت، نەرمو نیانو خۆشەویستو بەسۆزو دڵسۆزبە، بۆ خەڵکی، ئەو کاتە خەڵکیش وادەبن لە بەرامبەرت.

**٤٢- لە بەرامبەر کێشەکانت مەڕوخێ:**

وابیرمەکەوە ئەگەرلە ژیانت کێشەیەکت ڕووبەڕووبووەوە، یان لە کارەکەتدا، ئەوا دونیا تەواوبووەو تازە هەموو شتێك کۆتایی پێهاتو بە هیچ شێوەیەك ئەو کێشەی تۆ چارەسەری نییە، نەخێر وانییە بە پێچەوانەوە، بەڵکو هەوڵبدە، هەوڵبدە، هەوڵبدە تا بەسەریدا زاڵ دەبیت، پاشان لە (خودای) گەورە بپاڕێرەوە تاوەکو تواناو هێزت پێببەخشێت، بۆ ئەوەی بەسەرکێشەکانتدا زاڵ بیتو کار ئاسانیت بۆ بکات.

**٤٣- ئاڕاستەی خۆت دیاری بکە:**

بێگومان تۆ ناتوانیت ڕێڕەوی ڕووداوەکانی ئێستاو ڕابردوو بگۆڕیت، ناتوانیت پەرچەکرداری خەڵکی لە کارو دەوروبەرت، یان هەر شوێنێکی تر بگۆڕیت، بەڵام منو تۆش دەتوانین ڕێگایەکی شیاو هەڵبژێرین لەناو خەڵکیدا، هەروەها دەتوانین ڕێگاو ئاڕاستەی بیرکردنەوەشمان دیاری بکەین.

**٤٤- مەحاڵ (موستەحیل) بوونی نییە؟**

ئایا شتێك هەیە لە ژیانتدا کە بتەوێت بیگۆڕیت؟! هەموو شتێك شایەنی گۆڕینەو مەحاڵ بوونی نییە، کەواتە دەست بە گۆڕانکاری بکە بە شێوازی خۆت، سەرەتا بە قسەی خۆش لەگەڵ کەسانی تر، بە جۆرێك با زمانت هەنگوین فڕێ بدات، قسەی جوانو چاك، زەردەخەنەیەك کە لە دڵەوە هەڵقوڵا بێت، قسەی گەشبینانە بە بەردەوامی، لەگەڵ هەستو نەستی خەڵکی بەشداربە، ئەو ڕێگایانەش هەمووی تاقیکراوەتەوەو سەرکەوتوو بووە، دەی گەر تۆش وابکەی ئەو کات دەبینی کە ڕێگایەکی گوڵڕێژکراوت هەڵبژاردووە.

کارگێڕیزان

# کارامەیی کارگێڕی به شارەزاییە، یان زانست؟!

ئا: م. هاژە شێروانی



هونەری کارگێری پشتبەستووە بە کەسایەتی بەڕێوەبەرو دانایی‌و درککردنی بە گرفتەکان، چۆن هەر تاکێك زۆرینەی کاتی بەستراوەتەوە بە مامەڵەکردن لەگەڵ ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکان وەك: خوێندنگە، نەخۆشخانە، دامەزراوی ئاینی، دەستەو فەرمانگەی حکومی، پرۆژە بازرگانییەکان، سەنتەرە کۆمەڵایەتییەکان کە لە لایەن خۆیانەوە یارمەتیدەرن لەسەر گەیشتن بە دەسکەوتی زیاترو ئامانجەکان بەوپەری خێرایی‌و کارایی، کە دەتوانین پێناسەی ڕێکخراوەکانیش بکەین بەوەی بریتییە لە یەکەی کۆمەڵایەتی، یان گردبوونەوەی مرۆیی کە پێکدێت بە شێوازێکی خۆبەخشانە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجی دیاریکراو، کە لێرەدا کارگێڕیش ئەو هۆکارەیە بۆ ڕێکخراوەکان کە دەتوانێت بیگەیەنێتە ئامانجەکانی، هەر بۆیە دەبێت کە کارگێڕییەکیان هەبێت کە ئاستێکی بەرزی لە توانست هەبێت بۆ سەرکەوتنی دامەزراوەکەی، بە جۆرێك کە دەبینین هەموو تواناداریيەکی هونەری‌و ماددی‌و مرۆییان بۆ دابینکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتوونابن بە هۆی خراپی کارگێڕییەکەیان‌و نەبوونی توانستی کارگێڕیکار تیایدا، لە هەمان کاتدا ڕێکخراوی تر بەرچاودەکەون کە سەرکەوتنی بێ وێنەیان تۆمارکردووە، سەرەڕای کەمی سەرچاوە بەردەستەکانیان لە دەرەنجامی کارگێڕییە باشەکەیان، هەر بەو پێودانگەوە پێویستە کە سەرنج بدەینە سەر کارگێڕی پڕۆژەکانی کار کە سەرجەم کۆمپانیاو دامەزراوەو دەستەکانی... هتد، کە لە ڕێکخستنەکانی تر کە ڕاستەوخۆبێت، یان ناڕاستەوخۆ بەستراونەتەوە بە بەرهەمهێنان‌و دابەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە مرۆییەکان، ئەوەشی کە ڕێکخراو پڕۆژەیەکی کار بێت، هەر دەبێت کە چالاکی ئابووری هەبێت، کە بریتیی بێت لە:

أ- پێویستە پڕۆژەکە سوودێك بدۆزێتەوە لە دانی ئەم کالاّ، یان خزمەتە کە بەهایەکی شێوەیی، یان شوێنی، یان زەمانی دەبێت، بۆ نموونە پڕۆژەی دەرهێنانی نەوتی خاوو پاڵاوتنی بەهایەکی شێوەیی دەدات (بە چارەسەری پیشەسازی)، بەهای شوێنی (لە ڕێگای گواستنەوەی) بەهای زەمانیش (لە ڕێگای هەلگرتنی کالاّیەکی بۆ ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو).

ب- پێویستە کە پرۆژە کار بکات لەسەر پڕکردنەوەی پێداویستی ئابووری بۆ جەماوەرێکی دیاریکراو، لە بەرامبەر بەهایەکی ئابووری (کە نرخەکەیە).

هەر لێرەشەوە دابەشکردنو پۆلێن گەلێك هەن بۆ پرۆژەکانی کار کە گرنگترینیان:

**یەکەم: دابەشکردنی بە گوێرەی سروشتی چالاکی:**

١- پرۆژەکانی دەرهێنان: وەکو گەڕان بەدوای نەوتی خاوو کانزاو ماسیو... هتد.

٢- پیشەسازی گۆڕین: وەکو پیشەسازی ئۆتۆمبێل، خۆراكو بەرهەمەکانی نەوتو خواردنەوەکان.

٣- پرۆژەکانی بنیاتنان: وەکو دامەزراندنو دروستکردنی باڵەخانەو ...هتد.

٤- پرۆژەکانی بازرگانی: وەکو بازرگانی هێنانو بازرگانی بە تاكو بە کۆ.

٥- پرۆژەکانی خزمەتگوزاری: وەکو بانکەکانو کۆمپانیاکانی وەبەرهێنانو کۆمپانیای دڵنیاییو گواستنەوەو گەیاندن.

**دووەم: دابەشکردنی بە گوێرەی کارەکانی پرۆژە:**

١- کاری دارایی: بە گرنگترینی چالاکییەکانی هەر پرۆژەیەکی تەواو دادەنرێت، چونکە هەموو پرۆژەیەك پێویستی بە داراییە تا لە کارەکانی بەردەوامبێت.

٢- کاری بازاڕسازی: بە یەکێك لە چالاکیە سەرەکییەکانی پرۆژە دادەنرێت، چونکە بە پشتبەستن بە کاری بازاڕسازی کارەکانی تری، وەك بەرهەمهێنانو پارەدارکردن بەڕێوەدەچن، ئەم چالاکیانەی کە ئەنجامیان دەدات بریتین لە: دیراسەتکردنی بازاڕ، پلاندانان بۆ بەرهەمهێنان، نرخدانان، دابەشکردن، بانگەشەکردن.

٣- کاری بەرهەمهێنان: ئامانجی ئەم کارە دەرهێنانی توخمەکانی بەرهەمهێنانی جیاوازە لە سەرچاوەو ئامێرو هێزی کارو گۆڕینی بە شێوازێکی دیاریکراو، وەکو بەرهەمهێنانی کاڵاو خزمەت کە ئارەزووی بەکاربەرو کڕیارەکان پڕدەکاتەوە.

٤- کاری سەرچاوەی مرۆیی: ئامانجی دەرخستنو بەکارهێنانی سەرچاوەیەکی مرۆییە، بە شێوەیەکی بەرچاو کە لە ڕێگایەوە بە ئامانجەکانی پرۆژە بگات.

**سێیەم: دابەشکردن بە گوێرەی خاوەنداریەتی یاسایی:**

١- پرۆژە تاکە کەسییەکان:

ئەمانە دەگرێتەوە کە یەك کەس خاوەنداریەتیو بەڕێوەی دەباتو خۆی خاوەنی پرۆژەو بەڕێوەبەری داراییە لە هەمان کاتدا.

٢- کۆمپانیای هاوبەش: ئەمەش دوو کەس، یان زیاتر خاوەنینو بەشدارن لە بەڕێوەبردنی پرۆژە بە ئامانجی دەستخستنی قازانج.

٣- کۆمپانیای پشکداری: ئەمەش خاوەن کەسایەتییەکی مەعنەویو سەربەخۆیە لە کەسایەتی خاوەنەکانی کە پشکدارن بە سەرمایەکانیان، بە واتای یەکەیەکی یاسایی کە کارەکانی بە ناوی کۆمپانیا ئەنجامدەدات.

هەر لێرەوە دەتوانین کە سەیری کارگێڕی بکەین، بەوەی کە پێکدێت لەم توخمە سەرەکیانەی خوارەوە:-

١- تاکێك، یان کۆمەڵێك کە دەناسرێنەوە بە تواناو شارەزایی تایبەتیان، بۆئەوەی بەڕێوەبەریش کارا بێت، هەر دەبێت کە ئەم هەڵسەنگێنەرە سەرەکیانەی تێدابێت:

- کارامەیی فیکری: بریتییە لە توانادارى لەسەر وێناکردنێکی ورد بۆ بارودۆخەکەو دەستنیشانکردنی گرفتەکانی بە بەکارهێنانی شێوازی کارگێڕی گونجاو، لە پاڵ چۆنییەتی بەکارهێنانی لە پێگە دروستەکانی.

- کارامەیی هونەری: توانادارى لەسەر ئەداکردنی چالاکییەکی دیاریکراو لە بواری پسپۆڕی پەیوەندیدار بە سروشتی کارکردن.

- کارامەیی مرۆیی: توانادارى لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ تاکەکانو کاریگەری خستنەسەر ڕەفتاریان.

٢- کۆمەڵێك چالاکی، یان کار، کە پیاوانی کارگێڕی پێی هەڵدەستن وەکو: پلاندانان، ڕێکخستن، ئاڕاستەکردن، چاودێریکردن.

٣- دەستەواژەو چەمكو شێوازە کارگێڕییەکان کە نوێکراوەتەوەو پێشکەوتووە لە لایەن زانایانو ئەو کەسانەی کە کاری کارگێڕی دەکەن.

٤- سەرچاوەی مرۆییو ماددی کە بەکاردێت بە توانست بۆ گەیشتن بە ئامانجی پرۆژە.

٥- ژینگەی دەرەکی پرۆژە: کە کارگێڕی مامەڵەی لەگەڵ دەکاتو کاریگەری دەخاتە سەر کارابوونی.

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین: کە کارگێڕی زانستو هونەرە، چونکە فێربوونی کارگێڕی بە تەنها لە ڕێگای شارەزایی پرۆسەیەکی لەسەرخۆو بە تێچوو دادەنرێت لە زۆربەی بارەکاندا، هەرچی وانە وەرگیراوەکانن لە شارەزایی بەس نین بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکارگێڕییەکانو بڕیاردانی گونجاو، هەروەك پەنابردنە بەر شارەزایی بە تەنها بۆ کارگێڕی بە واتای فەرامۆشکردنی سامانی زانیاری سەردەمیانەیە لە کارگێڕیو شێوازەکانی کە یارمەتی بەڕێوەبەر دەدات لەسەر ئەداکردنی کارەکەی، هەروەك پێویستە لەسەرمان کە تێبینی هونەری کارگێڕی بکەین، کە پشتبەستووە بە کەسایەتی بەڕێوەبەرو داناییو درککردنی بە گرفتەکان، توانادارى لەسەر تێگەیشتنو ڕێزبەندی بیرۆکەو زانیارییەکان، ڕێکخستنو بەکارهێنانی ئەم شێوازانەی کە لە گەیشتن بە ئامانجی پلان بۆدانراو نزیکی دەکاتەوە.

بە سوود وەرگرتن لە گۆڤاری الإدارة

# ٥٠٠ بیرۆکەی قەشەنگ بۆ ڕێکخستنی هەموو شتێك...



ن: شیری بایکۆسفی..
و. بۆ عەرەبی: محمد عنان..
و. بۆ کوردی: زانکۆ قەرەداغی

## چاکترین شێوازو کەرەستە بۆ ڕێکخستنی ژیانت،لە ئۆفیس‌و ماڵ، لە کاتی خوێندن‌و کارو سەفەرو بازاڕدا...

**١٣٨- بەدواداچوونی فاکس:**

لە دەزگاکەتدا ژمارە فاکسی ئەو کەسانە تۆماربکە، کە زوو زوو نامەیان بۆ دەنێریت، یان لەسەر شریتی فاکسەکە تۆماریان بکە، ئەگەر ژمارەکان زۆربوون ئەوا بە پێی توانا کەمیان بکەرەوە.

**١٣٩- بڵندگۆی تەلەفۆن:**

لەو داهێنانە باشانەی کراوە، داهێنانی بڵندگۆی دەرەکییە بۆ تەلەفۆن، کە بە هۆیەوە دەنگی کەسی بەرامبەر دەبیستین بێبەکارهێنانی هاندەکە، لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانیت یەك بە دوای یەکدا ژمارەکە دووبارە بکەیتەوە، ئەگەر تەلەفۆنی کەسی بەرامبەر لەگەڵ کەسێکی تردا لە کاردابوو، تا دواجار پەیوەندییەکەت بەدەستدێنی. سوود لەم تایبەتمەندێتیەی تەلەفۆن وەربگرەو کۆڵمەدە تا گوێت لە (هەلاو)ی بەرامبەر دەبێت.

**١٤٠- لە کاتی قسەکردندا:**

ئەگەر کاتت کەم بوو دەتوانیت لە کاتی تەلەفۆنکردندا هەندێك کاری ئاسان ئەنجامبدەیت، وەك ئەوەی پول بدەیت لە هەندێك نامەی ئامادەکراو، یان جیاکردنەوەی هەندێ نوسراو (أوراق)، یان سەرمێزەکەت ڕێکبخەیت، خۆ ئەگەر ئامێری تەلەفۆنەکەت هاندی بێتەلی هەبێت، ئەوا دەتوانیت خەریکی جل شۆردن بیت، بێئەوەی کەس بزانێت چیدەکەیت.

**١٤١- پەیوەندییەکی تەلەفۆنی سەرکەوتوو:**

نزیك ئامێری تەلەفۆنەکەت تیانوسێکی بچوك‌و پێنوسێك دابنێ، ئەو خاڵانەی تێدا بنووسە کە دەتەوێت لە پەیوەندییەکەدا قسەیان لەسەر بکەیت، ئەمە ئاسانکاریت بۆ دەکات لە پەیوەندییەکەتداو دڵنیاش دەبیت لەوەی کە شتێکت لە یاد نەچووەو ناچارنابیت پەیوەندییەکە دووبارە بکەیتەوە.

**١٤٢- دوای بەجێهێشتنی نامە:**

ئەگەر نامەیەکی دەنگیت بۆ کەسێك جێهێشت، لەسەر ڕیکۆردی تەلەفۆنەکەی لە تیانووسەکەی خۆتدا ناوەکەی تۆماربکەو لە بەرامبەریدا بنووسە (نامە)، تا ئەو نامەیەت لە یادنەچێتو دوای ئەوەی ئەو کەسە پەیوەندی پێوەکردیتەوە ئەوەی نوسیبووت بیسڕەوەو ئەگەر ویستت ژمارە تەلەفۆنەکەی لە تیانووسی ژمارە تەلەفۆنەکەتدا تۆماربکە.

**١٤٣- کۆمەڵێك پرسیار:**

ئەگەر ویستت داوای زانیاری لە کۆمپانیایەك بکەیت سەبارەت بە شتێك، یان داوات لێکرد وەڵامی کۆمەڵێك پرسیارت بداتەوە سەبارەت بە کڕین، یان چاککردنی ئامێریکی ناوماڵ، یان پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەك، بە تایبەت ئەگەر پەیوەندییەکەت لەگەڵ کۆمپانیایەکی سەرقاڵ‌و پڕ ئەرك بوو، ئەوا لیستێك بۆ پرسیارەکانت بە پێی گرنگیان ئامادە بکە، کاتێك وەڵامی پەیوەندییەکەیان دایتەوە، یەکەم وشە کە پێیان دەڵێیت: بڵێ (بە یارمەتیتان) دوو پرسیارم هەیە، دەتوانم؟ ئەگەر ئەم بنەمایەت نەزانی‌و ڕاستەوخۆ یەکەم پرسیارت کردو وتت: دەتوانم ناونیشانی کۆمپانیاکەتان بزانم، ئەوا گوێت لە تەنها وەڵامێك دەبێت: ژمارە ٥٠ شەقامی ڕزگاری‌و کۆتایی بە پەیوەندییەکە دێنێت، ئەمەش ناچارت دەکات جارێکی تر پەیوەندی بکەیتەوەو بەختەوەریت ئەگەر ئەو ڕۆژە وەڵامی پەیوەندییەکانت دەستکەوت.

**١٤٤- پێداچوونەوەی فاتورەی ژمارە تەلەفۆنەکانت:**

ئەو تۆمارەی کە پەیوەندییە تەلەفۆنییە دەرەکییەکانتی تیانووسراوە، نزیك لە تەلەفۆنەکە دابنێ، تا لە هەلێکی نزیکدا لەگەڵ فاتورەکەت بەراوردیان بکەیت، ئەگەر ژمارەکان لە هەردوو لیستەکەدا چونییەك نەبوون، ئەوا پرسیار لە فەرمانگەی تایبەت بکەیت.

**١٤٥- سوود لە داشکاندنی نرخ وەربگرە:**

ئەگەر پەیوەندییە دەرەکییەکانت زۆربوون، ئەوا دەبێت

ئاگاداری نرخ بیت، چونکە ئەو نرخانە بەپێی کاتەکانی ڕۆژ دەگۆڕێن و کەم و زیاد دەکەن، هەروەها لە پشووی هەفتانەدا ئەم زانیاریانە پەیدابکەو لە تەنیشت تەلەفۆنەکە دایانبنێ تا بە پێی توانا لەو کاتانەدا پەیوەندییەکانت، ئەنجام بدەیت کە کەمترین نرخیان هەیە.

## ١٤٦- ئەوە بکە کە پێتخۆشە:

هەردوو ڕێنمایی تەلەفۆن و ڕۆژنامەی فەرمی دەوڵەت (الوقائع) ماڵی خۆتن و هەرکامێکیانت دەوێ بەکاریبهێنە، وەك ئەوەی هێڵێك بەژێر ناوێکدا بهێنی، یان نیشانەیەك بەرامبەری دابنێی، سڵ مەکەو بە تەواوی سودیان لێوەربگرە.

## ١٤٧- پەیوەندی تەلەفۆنی، یان فاکس، یان سەردانێك:

هەموو ڕێگاکانی پەیوەندیکردن هەڵسەنگێنەو کات و ماندوبوونی پێویستیش بەرچاوبگرە بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکەت، دوایی پرسیار لە خۆت بکە: کامە چاکترین ڕێگایە بۆ گەیاندنی پەیامەکە؟ ئایا بە پەیوەندیکردنێکی تەلەفۆنی، ئایا بە فاکس بینێرم، یان سەردانێك کاریگەرتر دەبێت؟ دیاری بکە کام ڕێگایان گونجاوترینیانە بۆ تۆ، دووبارە لە خۆت بپرسە: ئایا ئەم پەیوەندییە هەر لە بنچینەوە پێویستە؟!

## کۆمپیوتەر:

## ١٤٨- هەمان پرەنسیپی ڕێکخستنی دۆسییەکان:

بۆ ئامادەکردنی دۆسییەی کۆمپیوتەری وCD هەمان ئەو ناونیشانانە بەکاربهێنە کە بۆ دۆسیەی ئاسایی(کاغە) بەکاریاندەهێنیت. هەمان بنەماو پرەنسیپی ڕێکخستنی دۆسییە دەگونجێ لەگەڵ هەر سیستمێکی پاراستنی دۆسییە (چ بە کۆمپیوتەر، یان بە ڕێگەی تر)، چونکە ئەم سیستمە سیستمێکی چاکەو بە ئاسانی یارمەتی دۆزینەوەی هەر دۆسییەیەکی هەڵگیراوت دەدات.

## ١٤٩- هەموو ڕۆژێك، ڕۆژێکی نوێیە:

ئەگەر ویستت ناو بۆ دۆسیەیەك، یان بۆ کۆمەڵێك دۆسییەی کاتی دابنێیت و بە خێرایی، ئەوا بەرواری ئەو ڕۆژە وەك بەشێك لەو ناوە سوود لێوەربگرەو ساڵەکەشی لەگەڵدا بنووسە، ئەو بیرۆکەیە بۆ پاراستنی چەند کۆپییەك لە یەك دۆسیەی هەمان بەڵگەنامەش بەسوودە، چونکە ئەم ڕێگەیە ئەگەری دووبارەبوونەوەی هەمان ناو لەگەڵ دۆسیەیەکی تردا ناهێڵێت، کە لە بەڵگەنامەیەکی ترەوە وەرگیرابێت، چونکە ئەگەر ئەمە ڕوویدات ئەوا دۆسییەی یەکەم ون دەبێت، ئەمە جگە لەوەی تەنها بە کردنەوەی دۆسییەکە ڕۆژی دروستکردن و پاراستنی دۆسیەکەت بۆ دەردەکەوێت.

## ١٥٠- شوێنێك لەسەر مێزەکەت بهێڵەرەوە:

بۆئەوەی شوێنێکی چۆڵ لەسەر ڕووی مێزەکەت بمێنێتەوە، هەوڵ بدە هەندێ پارچەی کۆمپیوتەرەکەت لەو جۆرە بن کە دەتوانرێت لە تەنیشت مێزەکەوە لەسەر زەوی دابنرێن. لەم حاڵەدا ئاگاداربە کە هاردیسکەکەت لە بارێکی گونجاودا بێت، زۆربەی فرۆشگەکانی کۆمپیوتەر دەتوانن لەم بارەوە ڕێنمایی بەسوودت پێشکەش بکەن و کێشەی لەو جۆرەت بۆ چارەسەر بکەن و دەشتوانی ئەو نامیلکانە بخوێنیتەوە کە دەربارەی ئەم بابەتە نوسراون.

## ١٥١- دەسوڕێ و بە پشت و ڕوودا دەخرێت:

زۆرینەی ئەو سکرینانەی کە ئێستا لە بازاڕەکاندا دەفرۆشێن، بنکەکانیان لەگەڵە کە دەتوانرێ سکرینەکە لەسەری بسوڕێنرێ و ڕووی شاشەکەش بە پشت و ڕوودابخرێت، ئەگەر سکرین و بنکەیەکی لەم بابەتەت هەبوو، تەممەڵی مەکەو شاشەکە بە هەردوو بارەکەدا بجوڵێنەوە تا حاڵێکی باش و گونجاوی بۆ دەدۆزیتەوە، ئەگەر لەو جۆرەش نەبوو، ئەوا هەوڵ بدە دانەیەك لەو بنکانە پەیدا بکەیت و سکرینەکەتی لەسەر دابنێ لە پێناو تەندروستی چاوەکانتا.

## ١٥٢- پارچەیەکی زیاد لە مێزەکەت ببەستە:

ئەگەر ڕووی مێزی کۆمپیوتەرەکەت زۆر فراوان نەبوو، ئەوا لە ژێرەوە چەکمەجەیەك دابنێ و کیبۆردەکەی لەسەر دابنێ، بەمەش کیبۆردەکە لە تەپوتۆز پارێزراو دەبێت و لەسەر ڕووی مێزەکەش جێگات ناگرێت، ئەگەر جێگا هەبوو دەتوانی خانەیەکی تریش لە ژێر ئەوەوە دابنێی بۆ پەڕە کاغەزو دۆسیەو شتی تر.

## ١٥٣- پلانێك بۆ ڕێکخستنی مێزی کۆمپیوتەرەکەت:

کاتێك مێزێك بۆ کۆمپیوتەرەکەت دەکڕیت، دانەیەك هەڵبژێرە کە پان و فراوان دێتە بەرچاوت و ئەوەندەش بەرزبێت کە بەرامبەری دادەنیشی سکرینەکە لە ئاستی چاودا بێت پێویستت بە سەر بەرزکردنەوەو نزمکردنەوە نەبێت، هەروەها دەبێت بەرزی کیبۆردەکەش گونجاو بێت و لە کاتی بەکارهێنانیدا دەستت ماندوو نەکات. لە یادت نەچێت کە جێگا بۆ پرنتەر و CDو کتێب و ئەو کاغەزانەش کە لە ئیش و کارەکانتا بەکاریدەهێنیت دابینبکەیت. هەروەها یادت بێت ئەم شتانەی دوایی لە کوێدا دادەنێیت، کاتێك پێویستت بە ڕووی مێزەکەت دەبێت بۆ کارێکی تر.

## ١٥٤- کۆمپیوتەرەکەت بۆ شتی تریش بەکاربهێنە:

ئەگەر کۆمپیوتەرێکی تایبەت بە خۆت هەبوو لە جۆری IBM compatible یان Macintosh، ئەوا دەتوانیت جاروبار بۆ پشوویەك و حەوانەوەی مێشکت سوود لە پرۆگرامی یاری و سەرگەرمی وەربگریت، پرۆگرامی تریش هەن یارمەتیت دەدەن لە ڕێکخستنی ئیش و کارەکانی ژیانتدا، وەك ژمێریاری تایبەت بە خۆت و دیزاین و نەخشەی نوێ بۆ ماڵەکەت، هەروەك دەتوانی لە ڕێی ئەو پرۆگرامانەوە ئامێری تەلەفۆنەکەت ببەستیت بە کۆمپیوتەرەکەتەوە، لەو ڕێگایەوە پەیوەندی بە بانك و بازاڕەکانەوە بکەیت لە میانەی حساباتی تایبەتی خۆتەوە لە بانك، هەمیشە بە شوێن پرۆگرامی نوێ و سوودبەخشدا بگەڕێ و لەو بوارانەدا بەکاریان بهێنە.

ئاگاداری: هەندێ لەم پرۆگرامانە جێگایەکی زۆر لەسەر کۆمپیوتەر داگیردەکەن، لەو خاڵە دڵنیابەرەوە پێش ئەوەی ئەو پرۆگرامانە بکڕیت.

## ١٥٥- پرۆگرامگەلێکی ڕێکخەر:

پرۆگرامگەلێکی چاك هەن کە لەسەر سیستمی IBM Macintos، ئیش دەکەن و یارمەتیت دەدەن لە بواری ڕێکخستندا، دوان لەم پرۆگرامانە بریتین لە Desqview ، Side kick ئەم پرۆگرامانە تەنها ڕێکخەری ئەلیکترۆنی نین، بەڵکو کەش و هەوای کارکردنت بۆ ڕێکدەخەن کاتێك ئیش لەسەر کۆمپیوتەرە تایبەتییەکەی خۆت، یان لەناو تۆڕێکی کۆمپیوتەردا ئیش دەکەیت. هەردوو پرۆگرامەکە کۆمەڵێك ئەجەندەو خشتەی ڕێکخستنی کات و ژمێریاری و یادنامە لە خۆدەگرن. هەروەك دەتوانیت لە ڕێی ئەم پرۆگرامانەوە ئەدای کۆمپیوتەرەکەت بەرەو پێش ببەیت و کاری جۆراوجۆری لەیەك کاتدا پێ ئەنجام بدەیت، وەك ئەوەی لەسەر بەشی پێشەوەی شاشە خەریکی ڕێکخستنی خشتەیەك بیت و لە هەمانکاتدا لە باگراوندی شاشەکەدا پرۆسەیەکی تر بەڕێوەبچێت، وەك شیکارییەکی دارایی (تحليل مالي). هەروەها ئەم پرۆگرامانە ئەجەندەی ناونیشان و دۆزەرەوەی خێرای ژمارە تەلەفۆن و پەیوەندیکردن بەهۆی مۆدیۆمەوە لە خۆ دەگرێت. پرۆگرامی Sidekick دەتوانێ بەهۆی زەنگێکەوە ئاگادارت بکاتەوە لە کارێکی دیاریکراو، وەك خواردنی دەرمانێك، یان پەیوەندییەکی تەلەفۆنی پێویست لە کاتی خۆیدا، ئەمە لە کاتێکدا دەزگای کۆمپیوتەرەکە داگیرساو، یان کوژاوە بێت.



# بەڕێوەبەر هەر بەڕێوەبەری دەکات

# چ یاری بکات.. چ کار ڕایی بکات

ل: ڕۆی لانتز
و: ئەسکەندەر ڕەحیم

ژیان یارییەکە، پڕە لە گزیو فێڵو تەڵەکەبازی، سا ئەگەر بردتەوە، خۆشی شادی دادتدەگرێتو ئەگەر دۆڕاندیشت، خەمو پەژارە سەرو دڵت دەگرێت.

یاریی «هەڵدانی ناڵە ئەسپ»یش هەر بەو چەشنەیە، پڕ لە داوو تەڵەیە. لە یەکێك لەو گەشتانەی، کۆمپانیاکەمان سازی کردبوو، بەشداریم لەو یارییەدا کرد. ئەو کات بەڕاستی کەوتمە ناو داوەکەوە، بەڵام فێری چەند وانەو پەندێك بووم، ئێستەش لە ژیانمدا جێبەجێی دەکەم. پێم باش بوو، بەسەرهاتەکەی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە، تا وەك من، نەکەونە ناو هەڵەوەو بەڵکو کەڵکیش، لە پەندو وانەکانم وەربگرن.

ئەوێ ڕۆژێ، لە یاریی «هەڵدانی ناڵە ئەسپ»دا، لەگەڵ هاوکارو سەرۆکەکەمدا بەشداریم کرد. جەنابی بەڕێوەبەر بەردەوام یارییەکەی دەبردەوەو کارمەندەکانی دەدۆڕان، ئەم کارە بەردەوام بوو، تا ئەو دەمەی بۆ ڕکابەریکردنی چوومە پێشو بەڕاستی لێم بردەوەو تۆڵەی هەموو هاوکارەکانم لێکردەوە! هەرچەند کارەکە، بە پیرۆزباییکردن دەستی پێکرد، بەڵام لە هەفتەی دواتردا، بە دەرکردنم دوایی هات.

ئەم ڕووداوە، پێنج پەندی بەبایەخی فێرکردم، ئەوانیش:

**پەندی یەکەم:وەرگرتنی بەرپرسیارێتیو لە ئەستۆگرتنی:**

مەبەستم ئەوە نییە، لە هەموو شتێکی ژیانتدا، جڵەوی کاروبار بەدەستەوە بگریت، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە، لەبەرامبەر بارودۆخە جیاوازەکاندا، بەسەر پەرچەرکردارەکانتدا زاڵ ببیت، چونکە ئەو دەمەی بۆ ململانێی بەڕێوەبەرەکەم چوومە پێش، ئەمن پەلەم کردو باجێکی قورسیشم دا.

هەڵبەت هەمووشمان ئازادو سەرپشکین، خۆ ئەگەر لە هەڵبژاردنەکەدا، شکستمان هێنا، ئەوا دەچینە ژێر ڕکێفی هێزێکی دیکەوەو لەبری ئێمە، بەو کارە هەڵدەسێت. ئیدی هەڵبژاردنەکەی خۆی بەسەرماندا، دەسەپێنێتو ئازادیو سەربەستیمان بەرتەسكو سنووردار دەکات.

**پەندی دووەم: با پەیوەندیت ڕوون بێت:**

کرۆکی پەیوەندیو هەڵسوکەوت، لەوەدا خۆی دەنوێنێت کە جوان زانیارییەکان، بۆ کەسی وەرگر بگوێزیتەوە، بەچەشنێك سەرودەری لێ بکاتو چاك ئەنجامی بدات. ئاشکرایە قسەی گوتراو، یان نووسراو، ئەو ڕۆڵە گرنگە نانوێنێت، کە هەواو نەوای دەنگ دەینوێنێت. ئەم هەواو نەوای دەنگە، ڕێژەی ٣٨٪ لە کرداری گواستنەوەی زانیاری دەنوێنێتو لە ڕووی گرنگییەوە، لەپاش زمانی جەستەوە دێت، کە لە کرداری زانیاری گواستنەوەدا، ڕێژەی ٥٥٪ دەنوێنێت، ئەمە لە کاتێکدا کاریگەری وشەکان، هەر ڕێژەی ٧٪ی ماناو مەبەستو کرداری زانیاری گواستنەوە پێکدەهێنێت! ئەمەش پەندێکی دیکەیە، کە فێربوونی شایستەو پێویستە. لە ڕاستیشدا هەم زمانی جەستەمو هەم هەواو نەوای دەنگم، لەبەردەم جەنابی بەڕێوەبەردا، هەستێکی پڕ لە ناشیرینیو بوغرایی، پیشان دا.. نەك کێبڕکێ، یان گاڵتەو گەپو بەس. بەو هۆیەوە پەرچەکردارەکەی توندبوو: کارەکەم لەدەست دا.

**پەندی سێیەم:ئەرێنی بەو ئاگات لە هەمبانەی کات بێت:**

ئەو دەمەی سەرۆکەکەم تێکشکاند، چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد، پاش کەمتر لە هەفتەیەك، کارەکەم لە دەستبدەم، چونکە زۆرتر لە ڕادەی پێویست گەشبین بووەو لە هەمبانەی هزرمدا ئەوەم دانەنابوو، کە ژیان قازانجو زیانە، بردنەوەو دۆڕانە، دەستکەوتنو لەدەستدانە.. ڕۆژێك بۆت لەبارە، ڕۆژێکی دیکەش لێت نالەبارە. ڕوونیشە بێئاگابوون لە گۆڕانی بارودۆخو هەلومەرجەکان، بۆ خۆی یەکێکە لە چەشنەکانی نەرێنیو بێهیوایی. هەر لەبەرئەوە ئامۆژگاریتان دەکەم بەو ئەرێنیو دڵ پڕهیوابوونەی کە خۆی دەنوێنێت لە گەشبینی لە دوارۆژو لە هەمان کاتیشدا بە ئاگاییو وریایی تێکەڵ بێت.

**پەندی چوارەم: بە سینەفراوانییەوە، شکست وەربگرە:**

لێرەدا گوتە ناوازەکەی «وینستۆن چەرچڵ»م دێتەوە یاد، کە دەڵێت: کرۆکی سەرکەوتنی ڕاستەقینە، خۆی لەوەدا دەنوێنێت، کە شکستو دۆڕانەکان، وەربگریت، خۆتیان ڕادەست نەکەیتو ملکەچیان نەبیت، لێیانەوە فێر ببیت، بە گوڕوتینەوە هەوڵ بدەیت، چۆك بە شکستەکان دابدەیتو وا لە شکست بکەیت، شکستبهێنێت.

کاتێك لە پیشەکەم وەدەرنرام، ڕاستە دنیا دوایی نەهات، بگرە ڕەنگە باشترین ڕووداویش بێت، کە لە ژینمدا بۆم هاتبێتە پێش، چونکە هیوای ئەوەی پێبەخشیم، تا بوارێکی باشتر لە کارداو شێوازێکی زۆر ئەرێنی لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ دۆخە جیاوازەکانی ژیاندا، هەڵبژێرم، لەوەش گرنگتر، ناونیشانی کتێبێکی نوێی هێنایە نێو هزروهۆشم، دیارە ژیان، ڕێگەکەی هەموارو گوڵڕێژ نەکراوە، وێڕای ئەوەش، چەندان پردو ڕێڕەو هەیە، ئەو ڕێگە پڕ کەندولەندو چاڵوچۆڵییانە، پێکەوە دەبەستنەوەو چەندان دەروازەو دەرووش هەن، لە ڕێڕەوە پێچاوپێچەکان دەمانپارێزن.

**پەندی پێنجەم: فێربەو بڕیارِ بدەو یەکسەر جێبەجێی بکە:**

باشترین کات، بۆ بەرەنگاربوونەوەی کارەساتە دڵتەزێنەکان، یان هەواڵە جەرگبڕەکان، ساتی ڕوودانیانە.. چونکە ئێمەومانان لە کایەی ژیاندا، هەر لەو دەمەی گیرۆدەی شکستو بەزینین، بڕیاری سەرکەوتنو سەرفرازی دەدەین. منیش بەش بە حاڵی خۆم، لە پاش ئانبڕینو وەدەرنانم، بڕیاری گۆڕینی پیشەکەی خۆمم دا. دەسا تۆش چاوەڕان مەبەو کاتی خۆت، لە خەمخواردنو پەنجەی پەشیمانی گەستندا، بەفیڕۆ مەدە، بەڵکو قۆڵی مەردانەی لێ هەڵبماڵەو کورجوگۆڵانە لە ئەزموونەکەت پەند وەربگرەو بڕیاری گۆڕینی ژیانت بەرەو باشتر بدەو دەستبەجێ بڕیارەکەت جێبەجێ بکە.

هەرچۆنێك بێت، بەزاندنو بۆڕدانی بەڕێوەبەرەکەم، هۆکاری ڕاستەوخۆی لەدەستچوونی کارەکەم نەبوو، سوکایەتیشم پێنەکرد، بەڵام ئەمە، ئەوە ناگەیەنێت، کە لێم پەستو تووڕە نەبوو، سا لەبەرئەوە هەوڵی لێلکردنی ڕوونی بەڕێوەبەرەکەت مەدە، چونکە بەڕێوەبەر هەر بەڕێوەبەرە، چ یاری بکات.. چ کار ڕایی بکات.

سەرچاوە: المحفزة الإدارية



# کێ ڕاستگۆترە لەگەڵ خۆی؟

و: محەممەد مێرگەیی

پادشــایەك هەبوو زۆر خەمخۆری وڵاتەکەی بوو، ئەم پادشــایە سێ کوڕی هەبوو، لە ناو خەڵکیدا بە ژیرو دادپەروەر ناسرابوون. دادپەروەری پادشا، وڵاتەکەی پڕکردبوو لە خۆشیو ئازادی.

ڕۆژێکیان پادشا بە مەبەستی ئەوەی بزانێت، لە دوای خۆی کام لە سێ کوڕەکانی دەتوانێت ببێتە پادشاو بە باشی کاروباری وڵات بەڕێوەدەبات، پــرسو ڕاوێژی بە هاوڕێ داناو ژیرەکەی خــۆی کرد، داناکەش بیرێکی کردەوەو پاش کەمێك گوتی: جەنابی پاشــا، ئەو کوڕەی کە دەبێت دوای تۆ دەســەڵات بگرێتە دەست، ئەوەیانە کە لەگەڵ خودی خۆی ڕاستگۆتر بێت، چونکە کەســی ڕاســتگۆ لە هیچ شتێك ناترسێتو ئەوەی کە لەناو ویــژدانو دەروونیدا هەیــە، هەرئەوەش بــۆ دەوروبەرەکەی دەردەخات، هەربۆیەش خەڵکەکە متمانەی زۆری پێدەکەنو زۆر خۆشیاندەوێت.

پادشــا گوتی: بەڵام چۆن بزانین کامیان ڕاســتگۆترە؟ خۆ من هەر سێکیانم خۆشدەوێتو جیاوازییان لە نێواندا ناکەم؟

داناکــە وەڵامیدایەوە: گــەورەم ئەگەر ڕێگە بەمــن بدەیت تاقییان بکەمــەوە، ئەوا بۆت دەردەکەوێت کامیان ڕاســتگۆترەو لەدوای تۆشــدا دەبێتە فەرمانڕەوای وڵات.

داناکە بیرۆکەی تاقیکردنەوەکەی بە پادشا ڕاگەیاند، ئەویش ڕازیبوو، لەسەر ئەمەو ئامۆژگاری سێ کوڕەکەی کرد کە گوێڕایەڵی داناکە بن.

داناکە بە شازادە گەورەکەی گوت: ئەمشەو شتێکت لە ژوورەکەی خۆتدا بۆ دانراوە، پێویســتە بیبەیتو گەشەی پێبدەیت، تاکو ژمارەی زیاد بکات، پاش سێ ساڵی تر بۆمان دەگەڕێنیتەوە تا بزانین چیت لێکردووە؟!

لە شــەوی دووەمیشــدا پیاوی دانا بە شــازادە ناوەنجییەکەی گوت: شــازادە، ئەمشەو لە ژوورەکەتدا شتێکت بۆ دانراوە، ئەو شتە ببەو دوای ســێ ســاڵی تر لە ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا بگەڕێرەوە بۆ لامان، با بزانین چۆن شتەکە گەشەی کردووەو ژمارەکەی زیادی کردووە!

لە شــەوی سێیەمدا، داناکە بە شازادەی بچووکی گوت: شازادەی لاو، ئەمشەو لە ژوورەکەی خۆتدا شتێکت بۆ دانراوە، ئەو شتە ببەو گەشەی پێبدە، تاکو ژمارەکەی زیاد دەبێت، ئینجا لەمڕۆوە تا دوای سێ ساڵی تر بگەڕێرەوە لامان، بۆئەوەی ببینین چیت کردووە!

ئیتر ئەوەبوو هەر لەو شــەوانەدا، ســێ کوڕەکەی پادشا دیارنەمانو لەگەڵ خۆیاندا ئەو شــتانەی لە ژوورەکانیانــدا دانرابوو بردیان، ئەوان بەو هیوایەبوون کە بە زووترین کات ئەو سێ ساڵە تەواوببێو بگەڕێنەوە دیدەنی باوکیانو پیاوە داناکە.

پاش ئەوەی ماوەی ســێ ســاڵەکە تەواوبوو، لەڕۆژی یەکەمدا شــازادە گەورەکــە بــە مێگەلێکی گــەورەی مەڕو ماڵاتــەوە گەڕایەوە، شــازادە بە خۆشحاڵییەوە گەیشتە لای باوکیو پیاوە داناکەو گوتی: باوکی پادشام، ئەوە ئەرکەکەم بەجێهێناوەو هیوادارم لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوو بووبم.

بەڵام پیاوە داناکە لێی پرســی: شازادە پێمان بڵێ: چۆن ئەم هەموو ڕانە مەڕەت بەدەستهێنا!؟

شازادەش وتی: کاتێك ئەو مەڕەم برد کە لە ژوورەکەم داتنابوو، دوای چەنــد مانگێــك دوو بەرخی بوو، پاش ماوەیەك بەرخەکانم فرۆشــتو بەنرخــی ئــەوان مەڕێکی ترم کــڕی، ئەویش دوو بەرخــی تری هێناو بەوشــێوەیە دەستمکرد بە کڕینو فرۆشــتن، تا وای لێهات ڕانە مەڕەکە زیادی کرد، ئەمەش بەهۆی ئەو مەڕەی کە بۆتان بەجێهێشتبووم.

بێزارییو نارەزامەندیی لەســەر ڕووخساری پادشا ڕەنگیدایەوەو لە شازادەی پرسی: بەڵام چۆن ئەو مەڕەی لە ژوورەکەت دامانانابوو زاوزێی کــردو زیاد بــوو، مەڕەکە لە پیریدا لە زاوزێ وەســتابوو؟! هیواداربووم لەگەڵ خۆتو لەگەڵ ئێمەشدا ڕاستگۆتربایت!

شازادە هەستی بە شەرمەزاریی کردو داوای لێبوردنی کرد..

ڕۆژی دواتــر، شــازادە ناوەنجیەکــە گەڕایــەوەو لەگــەڵ خۆیــدا گالیسکەیەکی پڕواپڕی لە سەوزەواتی پاكو تازە هێنابوو، ئینجا خستییە بەردەمــی باوکــیو پیاوە داناکــەو گوتی: هیوادارم کە بەرهەمی باشــی کێلگەکەم تام بکەنو باســی ئەو ڕێگەیــەی بۆ کردن کە بە هۆیەوە ئەو تۆوەی گەشەپێداوە کە لە ژوورەکەیدا دانرابوو!

پادشــا تووڕەبوو گوتی: بەڵام شازادە چۆن ئەو تۆوانە گەشەیانکرد، ئــەو هەموو بەروبوومو ســەوزەواتەیان لێ پەیدابوو، لە کاتێکدا تۆوەکە خۆی تێکچوو برژێنراوبوو، هەرگیز بە کەڵکی کشتوکاڵ نەدەهات!

شــازادە هەستی بەشەرمەزارییو پەشــیمانی کرد، بۆیە گالیسکە پڕ لە سەوزەواتەکەی دایە پێش خۆیو لەبەرخۆیەوە دەیگوت: من گومانم وابوو کە خزمەتکارێکی دەبەنگ ئەو تۆوە خراپانەیان داناوە، نەوەك پیاوە داناکە!

شازادەی بچووك، بۆ ڕۆژی دواتر بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە، ئەمەش بووە هۆی سەرســوڕمانی پادشاو داناکەی هاوڕێی، هەردووکیان پێکەوەو بەیەك دەنگ پێیان گوت: شازادە ئەی کوا ئەو شتەی کە ئەو چەند ساڵە گەشەت پێداوە!؟

شــازادە وەڵامیدایەوەو گوتی: باوکی خۆشەویستمو پیاوی دانا.. ئایە چۆن دەکرێت من شــتێك لە هیچەوە گەشــە پێبدەم؟! ئەو کیسە پارەی کە لە ژوورەکەمدا دانرابوو، هیچ پارەی تێدانەبوو!

بەڵام لە ڕاستیدا من بیرم کردەوەو بڕیارمدا شتێکی تر گەشەپێبدەم، کە نە تۆ ئەی باوکە پێتداوەو نە پیاوە داناکەش لە ژوورەکەمدا بۆی بەجێهێشتبووم!

پادشاو دانا لەم قسەیە سەریان سوڕماو گوتیان: شازادە ئەو شتە چییە؟

شازادە وەڵامیدایەوە: من ڕۆیشتمو دەستمکرد بە کارکردن لە بازاڕو لە لای خەڵك، هەندێجار بازرگانیو هەندێجار کشتوکاڵ، هەندێجاریش شوانیو ڕاوکردن، هەروەها لە پاسەوانیو ئاسنگەریو زۆرێك پیشەی تر، هاوڕێیەتی خەڵکێکی زۆرم کردو سوودم لە بیرو شارەزایی ئەوان وەرگرت.

دیتــم کە چۆن ئــەو خەڵکە تێدەکۆشــنو ماندوودەبــن، بۆئەوەی کارەکانیان جێبەجێبکەنو ســەرکەوتووبن، بۆئــەوەی ژیانیان بەردەوام بێت، من ئەقڵو هۆشو ئاوەزم گەشــەی کرد، دۆستو ناسیاوم زۆربوون، لەشــم بەهێز بــوو، دەتوانم ڕووبەڕووی کاروبارە ســەختو دژوارەکانی ژیان ببمەوە، ئەمە هەموو گەشتەکەی من بوو!

پادشاو پیاوە داناکەی هاوڕێی کە گوێیان لەو قسانەی شازادە بوو، زۆر دڵخۆشبوون، پادشا دەستی شازادەی گرتو لەسەر کورسی دایناو گوتی: لە پاش مندا تۆ دەبیتە پادشــای وڵات، پیاوە داناکەش بە شازادەکەی گوت: تۆ ئەو پادشا دانایەی کە ڕاستگۆتر بوو لەگەڵ خودی خۆیدا.

سەرچاوە: گۆڤاری العربي الصغیر



بەشی یەکەم

# یاساکانی بازاڕسازی

ن: د. ئیبراهیم فەقێ.. و: وەهاب حەسیب

**١. یاسای سەرکردایەتی:** ئەوەیە یەکەمجار هەستی خەڵک داگیر بکەیت جا یەکەم بیت، لە شمەك، یان خزمەتگوزاری، تۆ یەکەمیت لە هەستکردن.

نموونە: یەکەم کۆمپیوتەر کەی لە جیهاندا دەرکەوت؟ ئایا کەس ئەمە دەزانێت؟ کەس نازانێت، بۆچی؟ لەبەرئەوەی نەیاندەزانی چۆن سوود لە ڕێسای پێشەوایەتی وەرگرن، بەڵام کاتێك یەکەم کۆمپیوتەرت بەبیر دێنمەوە، یەکەم شتێك کە بەبیرتا دێت کۆمپانیایی (Ibm)ە، لەبەرئەوەی ئەو یەکەمجار هەستی بزواندیت، بەڵام یەکەمینەکە ئەم ڕێسایەی بەکارنەهێنا، بۆیە دواتر کەس نەیناسی.

کاتێك پێت دەڵێم ژانە سەرم هەیە، وەڵامەکەت ئەوەیە حەبی ئیسپرین بەکاربهێنم بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئازار یەکەمجار کێشە لە سکدا دروستدەکات، دەگوترا (ئیسپرینی ئازاد).

لەو شتە ترسناکانەیە، هەروەها لەم یاسایەدا هەیە تۆ کاتێك دێیت شوێنی سەرکردە بگریتەوە، هەموو جارێك زەرەرمەند دەبێت، چونکە یەکەمجار ئەو هەستی خەڵکی داگیرکردووە دەبینیت ئەو کۆمپانیایەی لە قۆناغی دووەمو دواتردا دێت گەر بڵێت من پێشەنگ، یان یەکەمینم زەرەرمەند دەبێت، بەڵام دبێژێت ئێمە نەوەیەکی نوێین.

**٢. یاسای دەستە - تیپ:**

ئەگەر پێشەنگ نەبوویت، ئەوا هەستە بە دروستکردنی شتێكو داهێنانی تێدا بکە، (جێبەجێکردنی بیرۆکەیەك کە پێشتر کەس ئەو کارەی تاقی نەکردبێتەوە)" پێشەوابە لەم دەستە تازەیەدا، بەردەوام بیربکەرەوە، چی بکەم؟ پاشان دەبینیت... لەبەرئەوەی مێشکی مرۆڤ توانای (داهێنان) ئەوەی هەیە.

نموونە: کاتێك یەکەم بڵاڤۆکم بڵاوکردەوە، وێنەی خۆمم بە بەرگی بڵاوکراوەکەوە لکاندو ئەو کات ئەم بیرۆکەیە باو نەبوو، هۆکارەکە ئەوەبوو یەکێك لە کەنەدا چاوی پێمکەوت" وتی تۆ نوسەرەکەیت؟ وتم: بەڵێ. وتی ئەگەر تۆ لە ناوەوەی پەرتوکەکە خۆت بشاریتەوە، خەڵك چی بکڕن نووسەرەکەو کتێبەکەو ناونیشانو ناوەڕۆك، بەڵام یەکەمجار نوسەرەکە کاتێك چاوم کەوت بە دکتۆر مستەفا مەحمودو پەرتوکەکەم پێیەخشی تەماشای وێنەکەی کردم، پرسی ئەم وێنەیە بۆچی؟ وەڵامم دایەوە خەڵك ئیبراهیم فەقێ دەناسن، یان مستەفا مەحمود؟ ئەو وتی: مستەفا مەحمود، وەڵامی من ئەوەبوو: من ئەو وێنەیەم چەسپاند بە بەرگی پەرتوکەکەوە تا خەڵکی بمناسن.

**٣. یاسای پەیپێبردن (دەرککردن):**

ئەگەر پێشەنگ نەبویتو لە توانادا نەبوو شتێکی تازە بە ئەنجام بگەیەنیت، ئەوا ڕوو بەرەو یاسای دەرککردن وەربگێڕەو پەیی بە ئیدراکی خەڵك ببە" دەبینیت خەڵك بەرەو ڕووت دێن.

نموونە: هەندێك لە کۆمپانیاکان لە نیشتمانی عەرەبیدا کەوتنە پروپاگەندە بۆ خولی ڕاهێنان لە (برمجة اللغة العصبية) بڵاویان کردەوە کە بڕوانامەیان هەیەو باوەڕپێکراوە، بەڵام هەرچی بڕوانامەکانی ئیبراهیم فەقێیە باوەڕپێکراو نییە، هەستام بە قۆزتنەوەی ئەم دەرفەتەو گوتم من بڕوانامە نابەخشم، بچن لای ئەوان بڕوانامە وەرگرن، دواتر وەرنەوە من ڕاتان دەهێنم!! خەڵك دەرکیان کرد ئەگەر تۆ ئارەزوومەندی فێربیت وەرە پێشێ فێربە، دوای ماوەیەك فێرخوازان هەستیان بە بێسودی ئەوان (کۆمپانیاو ڕاهێنەرەکانیان) کرد، گوتیان ئێمە بڕوانامەمان ناوێت دەخوازین فێربین، هاتن بۆ لای ئیبراهیم فەقێ، دواتر من (نووسەر) هەستام بە قۆزتنەوەی یاسای پەیپێبردن ئەگەر یاسای سەرکردایەتیت نەبوو، ئەوا یاسای دەستە بەکاربێنە، ئەگەر ئەو یاسایەش لە توانادا نەبوو، ئەوا ڕێسایی دەرککردن بەکاربێنە، ئەگەر لە دڵی خەڵکیدا شوێنی خۆتکردەوە هەوڵمەدە لەگەڵ یاسای پێشەوایەتیدا پێکدادان دروست بکەیت، یاخود شتێکی تازە دابهێنیت هیچ واتایەکی نەبێت تا نەچیتە ناو ڕێسای گروپەوە.



## بۆ شێوازی خوێندن بۆ پۆلی (١٢)

لەگەڵ بڕیاردا تۆ هەمیشە لە پێشەوەی کارواندای!

لە نوێترین خولی فێربوونو ڕاهێناندا

لە ناوازەترین ئەزموونی کاریگەردا..

لە باشترین شێوازەکانی خوێندندا..

بۆ چۆنێتی خوێندنو بە دەستهێنانی نمرەی بەرز

لە خولی خوێندکارانی بە تواناداا بەشداری بکە

- مامۆستایانی شارەزاو بە ئەزموون
- خولی تایبەت بە (کوڕانو کچان)
- بەکارهێنانی نوێترین شێوازی جیهانی
- ژمارەیەکی دیاریکراو دوای چاوپێکەوتنو هەڵبژاردن
- لەگەڵ بڕیاردا هەمیشە بەرەو لوتکە، هەنگاو دەنێیت،

تەنها بە نامەیەکی (S.M.S)، ناوی سیانیو ناوی قوتابخانەکەت بۆ ئەم ژمارەیە بنێرە (٠٧٧١٤٦٩٠١٠٠)..

پەلە بکە، ژمارەی کورسییەکان دیاریکراون..





ئا: د. سۆران محمد غریب

# نەخۆشییە زایەندییەکان(ئایدز)

نەخۆشییە زایەندیەکان: بریتین لەو نەخۆشیانەی کە ڕێگەی سەرەکی گواستنەوەیان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر ڕێگەی زایەندییە(سێکسی)ە.

**جۆرەکانی ئەم نەخۆشییە:**

بە پێی هۆکارەکانیان دەکرێن بەم بەشانەی خوارەوە:

-انەخۆشییە بەکترییەکان، وەك:سوزەنك، فەرەنگی(سفلس)، کلامیدیا.

٢- نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان، وەك: (هەوکردنی جگەر) زەردویی، جۆری (Bئایدز، تامیسکی زاووزێ، پاپیلۆمە ڤایرۆس..

٣- نەخۆشییە مشەخۆرەکان، وەك: ترایکۆمۆنیاسس..

**ئایدز: (AIDS):**

چەند زانیارییەکی ژمارەیی دەربارەی ئایدز

- لە سەرەتای دۆزینەوەی تا ساڵی ٢٠٠٧ زیاتر لە ٣٥ ملیۆن کەس بە هۆی ئەم نەخۆشییەوە گیانیان لە دەستداوە.

- ساڵانە زیاتر لە ٥ ملیۆن کەس توشی ئەم نەخۆشییە دەبن.

- لە عێراق ٢٦٤ توشبوو تۆمارکراوە کە ١٩١ کەسیان مردوون.

- ئەم نەخۆشییە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە زیادبووندایە، ڕۆژانە دەبێتە هۆی مردنی ٦-٨ هەزار کەس.

**ئایدز (AIDS)**

- ئایدز (AIDS) کورتکراوەی (Acquired Immuno Deficiency syndrome) واتە نیشانەی کەمی بەرگری بە دەستهاتوو بە هۆی ڤایرۆسی HIV.

-ئەم ڤایرۆسە ٢ جۆری سەرەکی هەیە کە بریتین لە HIV1 کە زیاترلە ئەمریکاو ئەوروپادا بڵاوەوHIV2 کە لە ئەفریقیا بڵاوە.

- لە جیاکەرەوەکانی ئەم نەخۆشییە لاوازبوونو تێکچوونی دەزگای بەرگری لەشە، بە شێوەیەك ناتوانێت لەش لە هیچ نەخۆشییەك بپارێزێت.

**پێکهاتەی ڤایرۆسی ئایدز:**

- مێژووی سەرهەڵدانی ئەم نەخۆشییە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨١ لە شاری نیۆرك لە نێوان کۆمەڵێك لاوی هۆمۆ ڕەگەزبازدا، کە بۆ مەبەستی جۆرێك لە شێرپەنجەی پێست (سارکۆمای کاپۆسی) سەردانی پزیشکیان کرد.

**چۆنێتی پەلاماردانی سیستەمی بەرگری لەش:**

- پاش چونە ناوەوەی ڤایرۆسەکە بۆ ناو لەش، پەلاماری خڕۆکە سپییەکان دەدات، بە تایبەتی لیمفە خانەکات کە ناودەبرێن بە CD4 کە یەکەیەکی گرنگی بەرگری لەش پێکدەهێنن.

**ڕێگاکانی گواستنەوە:**

* کاری زایەندی (سێکسی) لە نێوان هەردوو ڕەگەز، یان هەمان ڕەگەز (homosexual).

* گواستنەوەی خوێنو پێکهاتەکانی.

* چاندنی ئەندام لە بەخشەرێکی توشبووەوە.

* دایك بۆ کۆرپەکەی ٢٠- ٢٥٪، ئەگەری تووشبوون لە ڕێی شیرپێدانەوە ١٣٪.

* سرنجی پیسبوو بە ڤایرۆسەکە بە تایبەت ئەو کەسانەی کە دەرمانە هۆشبەرەکان بەکاردێنن.

**نیشانەکان:**

بە شێوەیەکی گشتی نیشانەکانی سۆکە دەکرێت بەم بەشانەی خوارەوە:

١- کۆئەندامی هەرس: سکچونی درێژخایەن، هەوکردنی سورێنچك، هەوکردنی جگەر.

٢- کۆئەندامی هەناسە: هەوکردن، سیل، (دەردە باریکە).

٣-کۆئەندامی دەمار: هەوکردنی پەردەی مێشك، دەردەپشیلە، خەڵەفان.

٤- کاریگەری دەروونی: خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، ئەگەری خۆکوشتنیان زیاترە وەك لە تاکێکی ئاسایی.

**دەستنیشانکردن:**

- بە ڕێگەی ELISA پاش ١٢هەفتە نەخۆشییەکە دەستنیشان دەکرێت، بە دۆزینەوەی دژەتەن لە خوێنی تووشبووەکەدا.

- بە ڕێگەی western blot، ئەم ڕێگەیە هەستیارترە بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە.

کێ پێویستە پشکنینی HIV بۆ بکرێت:

* ئەو کەسانەی کە گومان دەکەن توشی ڤایرۆسەکە بوون.

* هەموو ژنێکی سکپڕ پێویستە لە ٣ مانگی یەکەمدا، تێستی HIV بکات.

* ئەوانەی کە خوێن دەبەخشن.

*ئەو کەسەی کە ئەندامێکی خۆی دەبەخشێت بە کەسێکی تر.

* پێش هاوسەرێتی پێویستە نێرو مێ تێستی خۆیان بکەن.

**خۆپاراستن:**

١-خۆپاراستن لە کاری سێکسی لەگەڵ کەسانی تر، جگە لە هاوسەر.

٢- بەکارهێنانی کۆندۆم (نێر، مێ).

٣- پشکنینی خوێنو پێکهاتەکانی پێش گواستنەوە.

٤-خەتەنەکردن ئەگەری تووشبون بە ڕێژەی٥٠٪ کەمدەکاتەوە.

**چارەسەرکردن:**

- تا ئێستا هیچ چارەسەرێك نییە بۆ ئەم نەخۆشییە، تووشبون بە مردن کۆتایی دێت.




ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

# هەڕەمی خۆراکی

لـەم دواییانـەدا پسـپۆڕەکان لە نەتـەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵسـاون بـە دووبارەکردنەوەی دابەشـکردنی کۆمەڵە خۆراکییەکانو ڕیزکردنیان بەشـێوەی هەڕەم، ناویان لێنا دابەشـکردنی هەڕەمی بۆ خۆراکەکان (food pyramid) – بڕوانە وێنەکە- کە کۆمەڵە خۆراکی جیاوازی لە خۆگرتووە، زیاد لەوەش باری فسیۆلۆجیو قەبارەو ژمارەی بڕە خۆراکییەکان..

**هەڕەمی خۆراکی نوێ:**

وەزارەتـی کشـتوکاڵ لە ویلایەتـە یەکگرتووەکان هەمیشە نوێکردنەوە دەکات لە هەڕەمی خۆراکی.

بڕی هەر کۆمەڵەیەک چەندە؟ بڕەکان پشت دەبەسـتێ بە کۆی ئـەو گەرمۆکە وزانەی کە تاک پێویستییەتی لە یەک ڕۆژدا.

**چالاکی لاشەیی:**

تاکو گەرمۆکە وزەی بەکارهێنراو زیاتر بێت، پێویستی لاشە بۆ چالاکی جەستەی زیاتر دەبێت بە لایەنی کەمەوە ٣٠ خولەک ڕۆژانە لە زۆربەی ڕۆژەکانی هەفتەدا.



**دانەوێڵە**
نیوەی کێشی گشتی خۆراک

**سەوزەوات**
تازە، بەستوو، لە فتونراو، وشککراوە بەشێوەی شەربەت

**میوە**
تازە، بەستوو، لە فتونراو، وشککراوە بەشێوەی شەربەت

**ڕۆن**
شل نەک ڕەق

**شیرەمەنی**
کەم، یان بێ چەوری دەوڵەمەندە بە کالیسیۆم

**خۆراکی پڕ پرۆتین**
گۆشتی ناسک، باڵندەکان، ماسی، هێلکە، دانەوێڵە، گوێز، تۆوەکان، پوختەی فولی سودانی (فستەقی زەوی)

| بڕ | دانەوێڵە | سەوزەوات | میوە | ڕۆن | شیرەمەنی | پرۆتینی زۆر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٠٠ گەرمۆکە | ٨٥ گم | ١ کوپ | ١ کوپ | ٣ کەوچکی بچوك | ٢ کوپ | ٥٧ گم |
| ٢٠٠٠ گەرمۆکە | ١٧٠ گم | ٢،٥ کوپ | ٢ کوپ | ٦ کەوچکی بچوك | ٣ کوپ | ١٥٦ گم |
| ٣٠٠٠ گەرمۆکە | ٢٨٠ گم | ٤ کوپ | ٢،٥ کوپ | ١١ کەوچکی بچوك | ٣ کوپ | ٢٠٠ گم |

سەرچاوە : وەزارەتی کشتوکاڵی ئەمریکا... (الشرق الأوسط)

**کۆمەڵەی ڕەنگی پرتەقاڵی:**

کۆمەڵــەی دانەوێڵــە دەگرێتــەوە، کە پێویستــە بەلایەنــی کەمــەوە (٩٠)گــرام لە خۆبگرێــت، ئەم کۆمەڵەیــە ئەمانە دەگرێتــەوە: نــان، دانەوێڵەکان، برنــج، مەعکەرۆنــی، لەگەڵ ئامــۆژگاری بەوەی کە نیــوەی خۆراکی ڕۆژانەمان دانەوێڵە لە خۆ بگرێ بە بێ لێکردنــەوەی توێکڵەکانیان، (لەبەرئەوەی توێکڵی دانەوێڵــە ژمارەیــەك لــە ڤیتامینــەکانو کانزاکانو ریشاڵەکان لە خۆدەگرێ).

کۆمەڵەی دانەوێڵەکان درێژە بە ژیانی تاك دەدەن، وەك بنچینەیــەك لــە کاربۆهێــدراتو هەندێــك لە ڤیتامینەکانو کانزاکانو توێکڵەکانی دانەوێڵەکان.

**کۆمەڵەی ڕەنگی سەوز:**

کۆمەڵێك ســەوزەوات دەگرێتــەوە، بەتایبەت ئەو ســەوزەواتانەی کە ڕەنگیان ســەوزی تۆخە، هەروەها ئــەو خۆراکانــەی ڕەنگیان پرتەقاڵیــە، زیاد لەوەش جۆرەکانی فاسۆلیاو لۆبیای وشك.

ئەو کەســانەی کە ڕۆژانــە (٢٠٠٠ گەرمۆکە وزە) بەکاردێنن، پێویستە خۆراکەکانیان ڕۆژانە (٢،٥)کوپ لە ســەوزەوات بگرێتەوە، دەکرێت ئەم برە کەم، یان زیاد بکرێت بە پێی پێویستی هەرکەسێك.

**کۆمەڵەی ڕەنگی سوور:**

میــوە دەگرێتــەوە، پێویستــە ٢ کوپ لــە میوەی جۆراوجــۆر بەکاربهێنین، جا تازە، یان بەســتو، یان لە قتونراو بێت، لەگەڵ کەمێك لە شەربەت (چونکە شەربەت بڕێکی کەم ریشاڵی تێدایە).

**کۆمەڵەی ڕەنگی زەرد:**

ڕۆنــەکان دەگرێتــەوە، ئامۆژگاریمــان ئەوەیە کە ســەرچاوەی ڕۆنەکانمان لە ماسیو پاقلەمەنییەکانو ڕۆنــە ڕووەکییــەکان بێــت، لەگــەڵ خۆپاراســتنو بەکارنەهێنانی ڕۆنی ڕەق وەکو :کەرە، پەنیر، چەوری دروستکراوو ڕۆنی تەنەکە.

**کۆمەڵەی ڕەنگی شین:**

کۆمەڵــەی شــیرو لێوەرگیراوەکانــی دەگرێتەوە، وەزارەتی کشــتوکاڵی ئەمریکا ئامــۆژگاری دەکات بە بەکارهێنانی نزیکەی ٣ کوپ لە شیر، بە جۆرێك کەم چەوری بێت، یان بێ چەوری بێت.

ئەو کەســانەی کە دەناڵێنن بە دەســت ئەوەی کە ناتوانــن شــیرەمەنییەکان بخۆن، ئەوا پێویســتە بە دوای ســەرچاوەیەکی تردا بگەڕێت کە کالیسیۆمی لە خۆ گرتبێ.

**کۆمەڵەی ڕەنگی مۆر:**

کۆمەڵێــك گۆشــتو پاقلەمەنــی دەگرێتــەوە، بەشــێوەیەك وەزارەتی کشتوکاڵی ئەمریکا پێشنیازی کردووە بە خواردنی گۆشتێك کە بڕێکی کەم چەوری لە خۆگرتبێو ئامادە بکرێت لە فرندا، یان بکوڵێنرێ نەوەك لەناو ڕۆندا سووربکرێتەوە.

ئەم ســایتەش بەســوودە بۆ زانینی بڕی پێویست بۆ هەر کەسێك:

(www.mypyramid.gov)

لــە ڕێی ئەم ســایتەوە دەتوانیت بڕی پێویســتی خــۆراك بۆ هەرکەســێك بزانیت، لە ڕێــگای زانینی ڕەگــەز (نێــر، یان مێ)و تەمەن (بە ســاڵ)، مەودای چالاکــی وەرزشــی، دوای دانانــی ئــەم زانیاریانە بە سایتەکە تۆش دەچیتە ناو هەرەمەکەوە.

ئەم هەرەمە تایبەتە بە هەموو مرۆڤێك هەر ڕەگەزێك بێــتو تەمەنی هەرچەند بێتو مــەودای ئەو چالاکییە وەرزشییەش کە ئەنجامی دەدات هەرچەند بێت..



# بازدان بۆ ئەودیوی دوو کۆ دوو!

درەخشان بەهادین

ئێستا ئێمە هەموو لە سەردەمی ژیارەکاندا دەژین، فێربوون بۆ هەموو مرۆڤەکان بە یەکێك لە پێویستییەکانی دەژمێردرێت. منداڵانی ئێمە بە زۆر دەخرێنە بەرخوێندن، تاوەکو فێربن کە دوو کۆ دوو دەکاتە چوار، ئەگەر ئەم هاوکێشە سادەیە فێرنەبن، ئەوا نمرەی دەرچوون وەرناگرن. دوو کۆ دوو دەبێت بکاتە چوارو منداڵانی سادەو بێ گوناهیش باوەڕ دەکەن کە دوو کۆ دوو هەمیشە دەکاتە چوار. بەڵام کاتێك گەورەتر دەبن‌و دەگەنە تەمەنی نەوجەوانی، کە لەوانەیە شوشەی زۆرێك لە باوەڕەکانیان درزی بردبێت، بەڵام هێشتا لەوە بێگومانن کە دوو کۆ دوو دەکاتە چوار. بەڵام کاتێك هەر ئەو منداڵانەی دوێنێ گەورەتر دەبن‌و دەگۆڕێن بۆ لاوانی بە کەیف‌و چالاکی ئەمڕۆ، لەو کاتەی کە هیچ نیشانێك لە مامۆستای منداڵیان نابێت، تاوەکو پێیان بڵێیت کە دوو کۆ دوو هەمیشە ناکاتە چوار! بۆیە زۆرێك لەو منداڵە سادانەی دوێنێ هەرگیز ناگەنە تەمەنی پێگەیشتن‌و ناتوانن لە هاوکێشەی دوو کۆ دوو یەکسانە بە چوار جیا ببنەوەو دەستبەرداری بن.

دیدو باوەڕی جیاواز بە یاسا کلێشەیی‌و بە ڤاڵبکراوەکانی پێشکەوتن‌و گەشەکردن گرفتێکە کە هەمیشە پسپۆڕانی سەرکەوتن ئاماژەی پێدەکەن.

دوو کۆ دوو دەتوانێت تەوژم بسێنێت‌و یەکسان بێت بە ژمارەیەکی زیاتر لە چوار، تەنها بە مەرجێ کە هەل‌و مەرجی ئەو بازدان‌و پەڕینەوە فەراهەم بێت. ئەمڕۆکەش وڵاتانی هەژارو گەشە نەسەندوو بە هۆی بەردەستبوونی کەرەستەو ئامێری سەردەمیانە توانیویانە لە ماوەی کەمتر لە تەمەنی نەوەیەك دواکەوتوویی چەند ساڵەی خۆیان قەرەبوو بکەنەوەو هاوشانی وڵاتانی پێشکەوتوو لە بوارە جیاوازەکاندا گەشە بکەن‌و پێشکەوتنی گەورەو ئەزموونی نوێ تۆمار بکەن.

بە پێی یاسای دوو کۆ دوو بێت، ئەوا ئەم پێشکەوتن‌و گەشەکردنە، کارێکی مەحاڵە. بەڵام کاتێك کە بارودۆخی تەوژم سەندن‌و پەڕینەوە کە بە شێوەو ڕێگا چارەیەکی ژیرانە فەراهەم بێت، ئیتر ئەو کات یاسا کۆنەکان نابنە بەڵگەو بەهەند وەرناگیرێن. لەبەر ئەمەشە کە هەوڵی زۆرێك لە شارەزایانی ڕێگای سەرکەوتن بۆ ئەوەیە کە سەرنجی هەموو مرۆڤەکان بە تایبەتی لاوان ئاڕاستەی ئەو ڕاستییە بکەن کە زۆرێك لە یاساکانی ڕۆژانی منداڵی بە جدی وەرنەگرن، قبوڵی بکەن کە ئەگەر بێت‌و لە هەل‌ومەرجێکی تەندروست‌و لە کات‌و شوێنێکی گونجاوو لە باردا بن، دەتوانن پەڕینەوەو بازدانی وەها تۆمار بکەن کە هەرگیز بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە.

لەم نێوانەشدا زۆرێك لە قوتابیانی بەردەم تاقیکردنەوە سەرتاسەرییەکان دەپرسن، کە ئایا دەکرێت لە ماوەی مانگێك، یان زیاتردا دواکەوتن‌و کەم‌و کورتییەکانی وانەکانیان پڕبکەنەوەو نمرەی بەرز بە دەستبێنن. بەشێکی زۆری ئەو قوتابیانە چونکە هێشتا باوەڕیان بە یاسای دوو کۆ دووی تەمەنی منداڵیانە، بۆیە هەرزوو دەگەنە ئەو وەڵامەی کە «نا» ئەم ڕووداوە مەحاڵە. لەبەرئەوە بەر لە هەر ڕووبەڕووبوونەوەو هەوڵدانێك تەسلیم دەبن. بەڵام کەسانێکیش هەن کە یاسای دوو کۆ دوویان قبوڵ نییە، بۆیە بە بەرنامەدانان‌و بڕیاری تەواوو هەوڵدانی بەردەوام وەها پەڕینەوەیەك لە بواری خوێندندا جێبەجێدەکەن‌و تاقیدەکەنەوە کە کەس، تەنانەت خۆشیان باوەڕناکەن.

لە بواری کارو بازرگانیشدا هەر ئەو یاسایە حوکمڕانە، هەرچەند وا باوە کە خەڵکی کارو بازاڕ زۆر پابەندی ژمارەو ژماردنن، ئامێری ژمێریاری‌و کۆمپیوتەر لە پێویستییەکانی کاری بازرگانین. بەڵام هەموو بازرگانە گەورەکان بێئەوەی خۆیان بزانن بە ملنان بە مامەڵەی گەورەو واژۆکردنی لیستی شمەکەکانیان دەست بە ڕووی تەواوی ئەو هاوکێشەیەو کارپێکردنی هاوکێشەکانیان دەنێن، بە کڕینی بە وەختی شمەکێکی گونجاوو فرۆشتنی لە کاتی خۆیدا سوودو قازانجی گەورەیان دەستدەکەوێت.

بۆیە دەبێت یەکێك بە لاوانی بێ هیواو بێ خەمی ئەمڕۆمان بڵێین، کە دەست لە بەڵگەو یاساکانی تەمەنی منداڵیان هەڵگرن‌و ژیان بە بیرکاری دەورانی سەرەتایی لێکنەدەنەوە. بەڵام دەڵێت: وەها کەسێك بوونی نییە، ئەگەر بوونیشی هەبوایە ئەوا زۆرێك لە لاوان تەنانەت گەورەو بە تەمەنەکانیش لە بەگوێکردنی قسەکانی دووردەکەوتنەوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، بەم خوێندنەوەو تێڕوانینە نوێیە، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە نابێت بۆ پەڕینەوەو بازدانی گەورە لە هەموو بوارەکاندا، هەمیشە هەموو شتێك بە هاوکێشەی دوو کۆ دوو یەکسانە بە چوار گرێ بدەین‌و بیپێوین. ئێوە چی دەڵێن‌و چۆن بیر دەکەنەوە؟!

زاهیر زانا



# لە گرفتەکانیش هێز وەربگرە

ژیانی مرۆڤ بێ کێشەو گرفتو ناهەمواری نییەو ڕەنگە لە هەر کاتێکدا مرۆڤ توشی جۆرەها نارەحەتیو دژواریو ئاستەنگ ببێتەوەو لەمەشەوە دەگەینە ئەوەی بڵێین کێشەو گرفتەکان، بەشێکی دانەبڕاوی ژیانو بوونیان سروشتییەو بوونی گرفت مانای تاڵی ژیانو دەست لێبەردانی نییە، بەڵکو زۆرجار کێشەکان خۆیان دەبنە هۆی خێرو دەرفەتی گۆڕانو بەرەو پێشچوونو چاکسازی، بۆ نموونە ڕەنگە کاتێك کێشەیەکی وەك لە دەستدانی کارمان دێتە ڕێگا، ببێتە هۆی دامەزراندنی کارێکی تایبەت بەخۆمان، یان دەستکەوتنی کارێك کە مووچەیەکی باشترو ماندووبونێکی کەمتریشی تێدابێت.

گرفتەکان دەرفەتی دەرخستنی تواناکانمانن، هیچ کێشەو گرفتێکیش لەسەروی توانای خۆمانەوە نییە تا نەتوانین چارەسەری بکەین، چۆنییەتی ڕوانینی ئێمە بۆ کێشەکان بەشێکی گەورەی چارەسەری کێشەکانە، بەجۆرێك بتوانین سازبین لەگەڵ کێشەکانو بە قەبارەی ئاسایی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەینو هەمووشتێك بەکێشە تێنەگەینو هەموو گرفتێکیش نەکەین بە کێشەی خۆمان.

کەسێك کە خەریکە بەرەو لوتکە هەنگاو هەڵدەگرێت، ئاستەنگو کۆسپ دێتەڕێی نەك کەسێك کە هەر لە جێی خۆیەتیو بۆ پێشەوە هەنگاو هەڵناگرێت، بۆیە دەبێت زۆرجار بەئاستەنگەکانیش خۆشحاڵبین، چونکە نیشانەی بەرەوپێشچونمانەو دەتوانین کێشەو گرفتەکان بکەینە سەرەتای نوێبوونەوەو بەخۆداچوونەوەو چارەسەریان بۆ دابنێینو پەندیان لێوە فێرببینو خەزێنەی ئەزمونی خۆمانیان پێ دەوڵەمەند بکەینو تواناو لێهاتوویی شاراوەکانمان زیاتر بەکاربهێنین، تا کانی بەهرەکانمان بتەقێتو لە بیابانی کێشەکاندا نەمامی خۆڕاگریو بەرەوپێشچوونو خۆشی بڕوێنینو بزانین تاکێشەکان ئاڵۆزتربن، ئەگەری کۆتاییهاتنیان نزیکترەو تاگەورەتربن چارەسەرەکانیان داهاتوویەکی گەشتر دێننە دی، چونکە تا زستان ساردتر بێت، بەهار ڕەنگاو ڕەنگترو گوڵو گوڵزاری زیاترو بەرهەمو بەروبوومی باشتردەبێتو هەموو شەوێك سکپڕە بەڕۆژو شەو هەتا تاریکتربێت، ئەستێرەو مانگی درەوشاوەترە!

بۆ هەر کێشەو گرفتێك زیاد لە چارەسەرێك هەیەو بۆیە کەسی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە تواناو لێهاتوویەکانی بۆ دۆزینەوەی دیاریکردنو هەڵبژاردنی باشترینو ئاسانترین چارەسەر دەخاتەگەڕ، بۆ چارەسەری گرفتەکان دەتوانین سود وەربگرین لە چوارگۆشەی چارەسەری کێشەکان، وەك لە خوارەوە هەر گۆشەیەکیان دەخەینە ڕوو:

**گۆشەی یەکەم:** ناسینی کێشەو گرفتەکە بە وردیو لە چەند ڕوویەکەوە بەشێوەیەکی ڕوونو وردو ڕێكو پێكو واقیعیو زانینی هۆکارو سەرچاوەی دروستبوونی گرفتو کێشەکە.

**گۆشەی دووەم:** زانینی هەموو ئەگەرە چاوەڕوانکراوەکانو خراپترین شتێك کە ئەگەری ڕوودانی هەیە، ئەمەش وامان لێدەکات بەرچاو ڕوون بینو قەبارەی گرفتەکەش بزانین.

**گۆشەی سێیەم:** گەڕان بەدوای دۆزینەوەی چارەسەرو جێگرەوە گونجاوو دروستەکانو ڕاوێژپێکردنی کەسانی شارەزاو دڵسۆز بۆ وەرگرتنی یارمەتیو سودوەرگرتن لە ئەزموونەکانیان.

**گۆشەی چوارەم:** هەڵبژاردنی ئەو چارەسەرەی کە وادەزانیت گونجاوترینو باشترین چارەسەرەو دەستبکە بەبەکارهێنانی بۆ چارەسەری کێشەکە، پشت بەخوا باشترین ئەنجامت دەستدەکەوێت.

بەو هیوایەی بەسەر تەواوی ئاستەنگو کێشەو گرفتەکانی ژیاندا سەربکەوینو هەمیشە لە بیرماندابێت، هەموو دەرگایەکی داخراو کلیلێك هەیە بیکاتەوەو لە گەڕان بەدوای ئەو کلیلەشدا ماندوونەبین.

محەممەد عەبدوڵا مێرگەیی



# وەفاداربە.. بۆ بەڵێنەکانت

وەفاو پەیمان، ئەو دوو وشە جوانەن کە زۆر لە عاشقانو ئەدیبانو نووسەرانو سیاسەتمەدارانو دەتوانین بڵێین: تەواوی مرۆڤایەتی، پێویستیان پێیانە، بۆئەوەی ڕەزامەندی بەرامبەرەکانیان بەدەستبێنن، لەبەرئەوە مرۆڤ پەنا بۆ چەکێکی زۆر گەورە دەبات، بۆئەوەی ئەو ڕەزامەندییە بەدەستبێنێت، ئەویش وشەی (وەفا)یە، کە گوایە بە وەفا دەبن بەرامبەر بەو بەڵێنەی کە داویانە، بەڵام ئاخۆ تا چەند ئێمە لە ژیانماندا پەیمانو بەڵێنەکانمان بەجێگەیاندووە، پێویستە هەرکەس لە ئێمە ئەم پرسیارە لە خۆی بکات، بەڵام پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی خۆمان بدەینەوە، با ئەم چیرۆکە بخوێنینەوە، تا بزانین مرۆڤی وەفادارو خاوەن پەیمان چەندە سوودمەندبوون لە ئەنجامی وەفاداریو بەجێهێنانی بەڵێنەکانیان..

دەگێڕنەوە لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا لە یەکێك لە شارەکانی وڵاتی ئەڵمانیادا، پارێزگاری شار سەرجەم کچانی شار کۆدەکاتەوەو پێیان ڕادەگەیەنێت کە پێویستە هەر یەکێك لە ئێوە هەفتانە نامەیەك بۆ کوڕە جەنگاوەرەکانی ئەم شارە بنووسن، تیایدا خۆشەویستی خۆتان دەرببڕن بەرامبەریانو بە باڵاو وەرەبەرزیو غیرەتو ئازایەتییاندا هەڵبڵێن، تا بتوانن زیاتر وەرەیان بەرزبکەنەوە، بۆئەوەی لە بەرەی جەنگ بێئومێد نەبن، ئەوانیش بە سنگێکی فراوانەوە پێشنیارەکەی جەنابی پارێزگاریان قبوڵکردو هەفتانە ئەو نامانە بە پۆستەچییەکدا بەرێدەکەن، دیارە لە ناو کچانی شاردا، کچێکیان زۆر ڕەوانبێژو پێنووس ڕەنگین بووە، نامەکانی زۆر کاریگەربوون، لەسەر ئەو سەربازەی کە نامەی بۆ ناردووە، سەربازەکانیش هەفتانە وەڵامی نامەکان دەدەنەوە..

ئەو سەربازەی کە نامەی ئەم کچە ڕەوانبێژو نووسەرو ڕووناکبیرەی پێدەگات، لە وەڵامی یەکێك لە نامەکانیدا پێشنیار بۆ ئەو کچە دەکات کە بە هەر نرخێك بێت دوای گەڕانەوەی لە جەنگ، دەیەوێت بیخوازێتو ببێتە هاوسەرو هاودەمی ژینی، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا ڕەنگو ڕووخساری نەبینیوە، بەڵام دیارە نامەکانی وێنای کەسێکی بە وەفاو ئەوینداری ڕاستەقینەو ڕۆشنبیر دەکات، لە وەڵامدا کچەکە بە پێشنیاری سەربازەکە ڕازی دەبێت، دوای گەیشتنی نامەی ڕەزامەندی، سەربازی لاو هەستدەکات کە پەلەیکردووە لەو بەڵێنەی کە بەو کچەی داوە، بیردەکاتەوە ئاخۆ ئەم کچە جوانە، یاخود ناشیرین؟ کورتەباڵایە، یاخود باڵابەرز؟... هتد، ئیدی دەیان خەیاڵی لەمجۆرە بە مێشکیدا دێت..

ڕۆژان دێو دەڕوات، ڕۆژێك هەواڵی پێدەدەن، کە دوای دە ڕۆژی دی، دەتوانێت بگەڕێتەوەماڵەوە، ئەویش دوانامە بۆ کچەکە دەنێرێتو تیایدا پێی ڕادەگەیەنێت کە ئەو دوای دە ڕۆژی تر دەگەڕێتەوەو حەزدەکات لە وێستگەی شەمەندەفەر چاوەڕێی بکاتو داواشی لێدەکات نیشانەیەکی بۆ دابنێت، بۆئەوەی یەکسەر دوای دابەزینی بیناسێتەوە، کچەکەش بە نامەیەکی جوانو پڕ لە سۆزومیهرەبانی وەڵامی دەداتەوەو خۆشحاڵی خۆی بە گەڕانەوەی دەردەبڕێتو پێی ڕادەگەیەنێت کە ئەو ڕۆژە ئەو لە وێستگە چاوەڕێی دەکاتو چەپکەیەك گوڵی (شلێر)ی پێیەو لەناو دەسکە گوڵەکەش پارچە کاغەزێك دانراوە، لێی نووسراوە (ئەوە منم، بمناسەرەوە)!

ئیتر سەربازەکە دیسان خەیاڵەکان میوانی دەبنو دوودڵیو نیگەرانی ئارامی لێهەڵدەگرێت، بە هەرحاڵ ڕۆژی گەڕانەوەی لە وێستگە دوای دابەزینی یەکسەر چاوی بەو کچە دەکەوێت کە چەپکە گوڵە شلێرەکەی بە دەستەوەیە، بەڵام چۆن کچێك، کورتەباڵایەکی بە تەمەن، ڤزێکی ناڕێکوپێك، ئەوەی مەیلی جوانی بێت تیایدا بە دی ناکات، بە بینینی زۆر دڵگران دەبێتو بەلایدا تێپەڕدەبێت، بێئەوەی خۆی بناسێنێت، چەند هەنگاوێك دووردەکەوێتەوەو دواتر لە ناخەوە پەشیمان دەبێتەوەو بە خۆی دەڵێت: کە زۆر پێویستە بە وەفابێت بەرامبەر بەو بەڵێنو پەیمانەی بەو کچەی داوە، هەروەها بە ئەمەکو وەفاداربێت بەرامبەر ئەو وشە جوانانەی ئەو کچە لە کاتە ناخۆشو دژوارەکانی جەنگدا بۆی ناردووە، لەبەرئەوە دەگەڕێتەوەو دەچێتە لایو پێی دەڵێت: من ئەو سەربازەم کە نامەکانت بۆ دەناردمو منیش بەڵێنم پێدایتو پێشنیارم بۆ کردیت کە ببیتە هاوسەری ژینمو تۆش قبوڵت کردو.. ئەویش قسەکانی پێدەبڕێتو پێی دەڵێت: ببورە ئەوە خانمەکەمە لەوبەری شەقامەکە چاوەڕێت دەکات، ئەو فەرمانی پێکردم بێمە ئێرەو چاوەڕێت بکەم، کە دەچێت چاوی بە کچێك دەکەوێت، کە هەرچی مانای جوانییە تێیدا کۆبۆتەوەو سەرەڕای ئەوەش کچی پارێزگاری شارەکەیە! دواتر کچەکە پێی دەڵێت: (بەڕاستی لاوی بەوەفاو پیاوی تاقیکردنەوەی سەخت، تەنیا تۆی، پیرۆزت بێت لە تاقیکردنەوە سەرکەوتوو بوویت)!

ئێستا تۆش دەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەیتەوە کە لە سەرەتای بابەتەکە ئاراستەت کرا!

# هیوا گەیاندمییە ئامانجەکەم!



بێگەرد فارس

کاتێك دایە گیانم گیانی سپاردووە، تەمەنم دوو ساڵان بووە، بە داخەوە تا ئێستاش نازانم چ شێوەیەکی هەبووە تا بیری لێ بکەمەوە، ئەو ساتانەش کە باسی دایك دەکرێت هەستێکی خەمبار دامدەگرێت، چونکە ناتوانم مەودای سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی ئەو بزانم، بەو شێوەیە بەبێ سۆزی دایك پەروەردەکراوم، کاتێکیش گەیشتمە تەمەنی نۆ ساڵان بابەگیانیشم دڵی لە کارکەوتو ئەویش بۆ هەمیشە بەجێیهێشتین!

بەڵام ئەوەی جێی دڵخۆشی بوو، ئەوەبوو باوکم ئافرەتێکی تری کردبووە خێزانیو لەویش چەند خوشكو برایەکم هەبوو، ئەو ئافرەتە بەڕێزە کە دەکاتە باوەژنی من، زۆر بەسۆزو خۆشەویستییەوە سۆزی دایکایەتی پێبەخشیبووم‌و هاوشێوەی منداڵەکانی خۆیو دەتوانم بڵێم زیاتریش لەوان گرنگی پێدەدام، بۆئەوەی من هەست بە بێ دایکی نەکەم، ئەو بۆشاییەی بۆ پڕکردبوومەوە، بەڵام بە داخەوە پاش مردنی بابەگیان ئیتر نەمدەتوانی پێویستی خوێندنگەم بە دەستبهێنم، هەرچەندە زۆر تامەزرۆی تەواوکردنی خوێندن بووم، بەڵام بە ناچاریو لەبەرکارکردنو پەیداکردنی بژێوی، خوێندنم بەجێهێشت، بۆ یارمەتیدانی خوشكو براکانم دەستم بە کار کردو کارێك نەمابوو نەمکردبێت، لە شوانیو کرێکاریو فرۆشتنی نایلۆنو ...هتد.

هەمیشە بەلای بیناو تەلاردا تێدەپەڕیم‌و بۆ ماوەیەك دەوەستام‌و باش سەیرم دەکرد، بۆ ئەوەی بزانم چۆن دروستکراوە، هەر لەو ساتەوە ئارەزووی بوون بە ئەندازیار بووە خولیام، هەربۆیە پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك پێمخۆش بوو بگەڕێمەوە خوێندنگە، هەرچەندە تەمەنم چەند ساڵێك لە هاوپۆلەکانم گەورەتربوو، بەڵام زۆر هیوام بە تەواوکردنی خوێندنو ئەنجامێکی باش لە داهاتوو هەبوو، هیچ نەبێت بۆئەوەی ژیانم بەرەو باشی بەرەو لە کارکردن ڕزگارم بێت.

یەکێك بووم لە خوێندکارە هەرە زیرەکەکانو زۆر هەوڵم دەدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانم، ئەوەی دڵتەنگی کردم، ئەوەبوو بە هۆی گەورەیی تەمەنەکەمەوە بڕیاری گواستنەوەم بۆ خوێندنگای ئێواران دەرچوو، بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە کاتێك گەیشتمە پۆلی شەشەمی ئامادەیی، بەهۆی ئەوەی کە زۆر زیرەك بووم، مامۆستایەکی بەڕێزم کە تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە یارمەتی دام‌و گەڕامەوە بۆ خوێندنی ئاساییو بە پشتیوانی خوای گەورە توانیم بگەمە کۆلێژی ئەندازیاری تەلارسازی!

هەرچەندە باری ئابووریم زۆر باش نەبوو، بەڵام زۆر بە قەناعەتەوە خوێندنم تەواوکردو یەکەمین نەخشەم کێشا بۆ ئەو خانووەی کە خۆم‌و خوشكو براکانم تێیدا دەژیاین.

باوەژنەکەم زۆر هاوکاری دەکردم‌و هەمیشە دەیگوت: خۆزگە پێش ئەوەی بمردمایە دەمتوانی هاوسەرێکت بۆ هەڵبژێرم، بەڵام قەدەری خوای گەورە وابوو کە بە ڕووداوی هاتوچۆ ئەویش بۆ دواجار ماڵاوایی لێکردین. خەمێکی زۆر دایگرتم، چونکە دووبارە دایکێکی دڵسۆزم لە دەستچوو، کە هەرگیز جیاوازی نەدەکرد لە نێوان منو منداڵەکانی خۆیدا!

ژیان بەردەوامبوو، منیش خوێندنم تەواوکردو سوپاس بۆ خوای گەورە دامەزرام‌و توانیم باری ژیانی خۆم بگۆڕم‌و ژیانی هاوسەریم پێکهێنا، ئێستاش چاوەڕێی هاتنە دونیای جوانترینو بەنرخترین نیعمەتی خوای گەورە دەکەینو ژیانێکی زۆر ئاسوودەو بەختەوەرمان هەیەو هەردوولا ئاواتەخوازی یارمەتیدانی هەژارانو بێ نەواو بێ باوکانین، بە پشتیوانی خوای گەورەش هەر بەردەوام دەبین لە کاری باشو سوودگەیاندن بە کۆمەڵو هەموو ئەوانەی پێویستیان بە ئێمەیە!

لە کۆتاییدا دەڵێم: تکایە هەرگیز بێ هیوا مەبن، ژیان بێ ناڕەحەتیو سەختییەکان هیچ مانایەکی نییە، گرنگ ئەوەیە ئارام بگرینو هیوا بڕاو نەبینو سووربین لەسەر بەدیهاتنی ئامانجەکان، ئەوسات دەزانن سەرکەوتن چ چێژێکی هەیە!



## لە پێنجەمینساڵیادی گۆڤاری بڕیاردا..

# لەگەڵ بەڕێز خاوەن ئیمتیازدا

بڕیار: بەڕێز خاوەن ئیمتیاز، هەستت چۆنە کە دەبینیت وا بڕیار پێدەنێتە ساڵی پێنجەمی تەمەنییەوە؟

خاوەن ئیمتیاز: هەستدەکەم گۆڤاری بڕیار مۆمێکی نەکوژاوەیە، (١٢) مۆمی ساڵی پێنجەم گەشترو ڕووناکتر دەبن، لە (٤٨) مۆمی ڕابردوو، چونکە هەروابووە، مۆمەکان ساڵ بە ساڵ گەشترو ڕووناکتربوون.

بڕیار: زۆربەی زۆری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بە (میدیای سێبەر )، واتە سێبەری دەسەڵات دەدرێنە قەڵەمو بە تێکدانی ڕیزی نیشتمانیو دروستکردنی کێشەو نانەوەی دووبەرەکیو زیانگەیاندن بە ئاسایشی نەتەوەیی تۆمەتباردەکرێن، هەندێکیش لەو بڵاوکراوانە ڕاپێچی دادگا دەکرێن، تۆ لەو نێوەندەدا بڕیار چۆن دەبینیت؟ سەدای بڕیارت چۆن دێتە بەرگوێ؟!

خاوەن ئیمتیاز: بڕیار سێبەری حەق دۆستانە، چارەسەی کێشەو گرفتەکانە، نەهێشتنی دووبەرەکییە، سوودگەیەنەرە بە ئاسایشی نەتەوەیی، هێورکەرەوەی دڵەکانە، کۆکەرەوەی خێزانەکانە!

بڕیار: ئەوانەی کە دەزانن خاوەن ئیمتیازی بڕیاریت چیت پێدەڵێن؟

خاوەن ئیمتیاز: پێمدەڵێن: دەستان خۆش بۆ ئەو کارە جوانە، ئەو بەرهەمە نایابە، بۆ ئەو ماریفەتە بڵندە، بەڕاستی بڕیار یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆییە لە کوردستاندا.

بڕیار: چۆن توانیوتانە لە ماوەی (٤) ساڵی ڕابردوودا بێ ڕاوەستان هەموو مانگێك گۆڤارەکەتان بکەوێتە بازاڕەوە؟ لە کاتێکدا زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەرەو ڕووی کێشەی زۆر دەبنەوە! ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئێوە هیچ کێشەیەکتان نییە؟!

خاوەن ئیمتیاز: بە پشتیوانی خودای گەورە، بە نزاو پاڕانەوەی دۆستانو هەوڵو ماندووبوونو هیممەتی سەرنووسەرو ستافی ماندوونەناسی بڕیارو سەرجەم نووسەرانی دڵسۆزی بڕیار، هاوکاریو پشتیوانی خوێنەرانی وەفاداری بڕیار، بڕیار هەموو مانگێك لە وادەی دیاری کراوی خۆیدا دەکەوێتە بەردیدی خوێنەرانی دڵسۆز، کە بە تاسەوە چاوەڕوانی دەرچوونی هەر ژمارەیەکی دەکەن..

سەبارەت بە بەشی دووەمی پرسیارەکەت، سوپاس بۆ خودا هیچ کێشەیەکمان نییە، بە پێچەوانەوە ژمارە دوای ژمارە دڵمان خۆشترو دەروونمان ئاسوودەتر دەبێت.

بڕیار: پەیوەندیت لەگەڵ سەرنووسەر چۆنە؟ چۆن تەماشای ئەدای کارەکەی دەکەیت؟ مانەوەی لە پۆستەکەیدا تا ئێستا، بەهۆی بەدەستهێنانی ڕازیبونی جەنابتەوەیە! یان سەرکەوتنی لە کارەکەیدا؟ تائێستا هیچ کێشەیەك لە نێوانتاندا ڕوویداوە؟!

خاوەن ئیمتیاز: پەیوەندیم لەگەڵ بەڕێز سەرنووسەردا زۆرباشە، جێگای ڕێزو خۆشەویستی هەمووانە، لە کارەکەی دا ڕاستو دڵسۆزە، هۆکاری مانەوەی لە پۆستەکەیدا سەرکەوتنو لێهاتووییو دڵسۆزییەتی بۆ کارەکەی، کەسێکی بە ئەزموونو بە تواناو خاوەن زانستو زانیارییو دڵسۆزو وەفادارو بە ئەمەکە، هیوای بەردەوامیو بەختەوەریو سەرکەوتنی زیاتری بۆ دەخوازم، بێگومان تا ئێستا بچووکترین کێشە لە نێوانماندا ڕووینەداوە.

بڕیار: دووا وتەت!!

خاوەن ئیمتیاز: دوا وتەم: لەگەڵ بڕیار فێربووم، کە ئەگەر ویستت کارێك ئەنجام بدەیت، بێگومان دەتوانیت ئەنجامی بدەیت، بە مەرجێك بیر لە بیرۆکەی نەرێنیو ڕووخێنەر نەکەیتەوە.

بە خوێنەرانی ئازیزی بڕیار دەڵێم: بە ڕاستی کاتی ئەوە هاتووە ئەو وتە بە نرخانەو ئەو بیرۆکە بەرزانە، ئەو بەرنامە گرنگانەی ناو لاپەڕەکانی بڕیار بگۆڕن بۆ کردار..

لە کۆتاییدا، سوپاسی جەنابی سەرنووسەرو سەرجەم ستافی کاراو ماندوونەناسی بڕیارو هەموو ئەو نووسەرانە دەکەم کە خۆبەخشانە لە بڕیاردا دەنووسن، هیوادارم هەروا لە خزمەتی خوێنەرانی بڕیارو گەلەکەیان بەردەوام بن، سوپاسی سەرجەم خوێنەرانی دڵسۆزی بڕیار دەکەم..



### لە پێنجەمین ساڵیادی گۆڤاری بڕیاردا..

# لەگەڵ بەڕێز سەرنووسەردا..

**بڕیار:** دوای چوار ساڵ تەمەن، وا گۆڤاری بڕیار وەك تاكە گۆڤاری مەیدانی خۆی، پێدەنێتە ساڵی پێنجەمەوە، هەستی تۆ چۆنە بەرامبەری؟

**سەرنووسەر:** دڵخۆشو شادمانم كە تائێستا بێ وچان توانیومانە بە بەردەوامی وەكو یەكەمینو تاكە گۆڤاری (كارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی) بەتایبەت كارگێڕی، لە خزمەتی خوێنەری كوردا بین!

ماندووبوونو شەونخوونی زۆرمان چەشتووە، بەڵام بۆ ئێمە تاموچێژی خۆی هەیەو هەست بە شادمانییەكی بێ سنوور دەكەینو سوپاسی خودای گەورە دەكەین.

**بڕیار:** زۆر گۆڤار سەرەتا ڕەوتێكی تایبەتی هەیەو دواتر گۆڕانكاری بەسەردا دێت، چۆنە بڕیار تا ئێستا لە ڕەوتی خۆی لای نەداوە؟

**سەرنووسەر:** بڕیار بەرنامەی تایبەتی خۆیو ئامانجی دیاریكراوی خۆی هەیەو ئەوەی دەیڵێتو دەینووسێتو هەوڵی بۆ دەدات، زۆر بە ئاشكرا گوزارشی لێوە دەكاتو هیچ ئامانجێكی شاراوەمان نییە كە لە پێناویدا تاكتیكەكانمان بگۆڕین.

ستراتیژیەتی ئێمە نەگۆڕە، دەمانەوێت مرۆڤی كورد بەرەو لوتكەی گەشەپێدانی مرۆیی بەرین، لامان وایە كە مرۆڤ بەردی بناغەی هەموو ژیانو شارستانییەتو پێشكەوتنێكە.

**بڕیار:** هیچ كەسو لایەنێك دەستی یارمەتی بۆ درێژكردون؟

**سەرنووسەر:** ئێمە ئەو كارەی پێی هەڵدەستین بە ئەركێكی نیشتمانی دەزانینو بە منەتی نازانینو چاوەڕوانی یارمەتیدانی پەروەردگار نەبێت، چاومان لە دەستی هیچ كەسو لایەنێك نییە، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا ئەو دەستانەی ویستویانە یارمەتیمان بدەن، بێ بەرامبەرنەبوونو مەرجداربوون، بۆیە ئێمەش بە هیچ شێوەیەك قبوڵمان نەبووە.

ئێمە لەوە نیگەران نین، بەڵام لەوە نیگەرانین كە ئەوە ئاماژەیەكی خراپە بۆ لاوازی هەستی بەرپرسیارێتیو ڕۆحی نیشتمانپەروەریو دڵسۆزی نەتەوەیە.

**بڕیار:** ئایا هیچ كەسو لایەنێك ویستوویانە بڕیار بكڕن؟

**سەرنووسەر:** بەڵێ هەر لە یەكەم ژمارەوە، هەندێكیش لایان وابووە بەرامبەر بە پارە ئێمە خۆمان بۆ ناگیرێتو یەكسەر تەسلیم دەبین، پێیان سەیر بوو، كە دەیانبینی ئێمە ئەوەی بە لامانەوە گرنگ نەبێت پارەیە، ئەوان سووربوون لەسەرئەوەی بێ پارە هیچ ناكرێتو باوەڕیان وابوو، كە ئێمە ناتوانین لە چەند ژمارەیەك زیاتر بەردەوام بین!

بەڵام لە دواییدا دەركەوت كە پارە هەموو شتێك نییە.

**بڕیار:** بەرامبەر بەمانە چی دەڵێیت؟**خاوەنی ئیمتیاز؟**

**سەرنووسەر:** خاوەنی گەورەترین پڕۆژە لە مێژووی هاوچەرخی كوردا، لە ناخی دڵمەوە لە بری هەموو تاكێكی دڵسۆزی كورد سوپاسی دەكەم، خودای گەورە سەرفرازو سەربەرزیان بكات..

**ستافی بڕیار؟**

- سەربازانی ونی هەمیشە بێدارو بە ئەمەكی بڕیار، بێ هەوڵو تێكۆشانی ئەوانو باقی نووسەرانی تر، بڕیار نەدەگەیشتە ئەمڕۆ!

**بەڕێوەبەری نووسین؟**

- پاسەوانی ئێشكگرو بێوێنەی بڕیار، ئەو كەسەی كە لە یەكەم ژمارەی بڕیارەوە تا ئێستا بێوچان كاری كردووە، بۆ ساتێك كەمتەرخەمی نەنواندووەو هەموو پیتەكانی گۆڤاری بڕیار پێی ئاشنان!!

**بەشی هونەریو دیزاین؟**

- سڵاوو ڕێزی تایبەتم بۆ برای بەڕێز كاك جمال دەروێشو یەكەمین دیزاینەری گۆڤاری بڕیار، هەروەها كاك قەیدار ڕحیمو كاك پشتیوان عبدالرحمن، كە هەموو مانگێك بڕیار لە بەرگێكی نوێدا پێشكەش بە خوێنەران دەكەن! سوپاسی برای ئەزیزم كاك (ئارام عەلی) دەكەم، كە لۆگۆی نوێی بڕیاری دروستكردووە.

**بڕیار:** دوا وتەت؟

- خوێنەرانی بەڕێز بیرۆكەكانی بڕیار بخەنە بواری پراكتیكو واقیعەوە، كات درەنگەو وەرنە مەیدانی كارو بە پڕۆژەی گەورەوە خزمەت بە گەلو نیشتمان بكەن!



# ئاسوودەیی دەروون لە بەخشیندایە..

لانە جەلال

جارێك فەیلەسوفێکی گەورە لەگەڵ یەکێك لە خوێندکارەکانی بەناو کێڵگەیەکدا پیاسەیان دەکرد، بینیان چاکەتێکو جووتێك پێڵاوی کۆن لەسەر لێواری ڕێگەکە دانراوە، وادیاربوو کە هی جوتیارێکی هەژار بێت کە لە ناو یەکێك لە کێڵگەکاندا سەرقاڵی کارکردنو ئاوەدانکردنەوەی باخو بێستانەکەیەتی..

خوێندکارەکە ئاوڕی دایەوە بۆ مامۆستاکەیو پێی گوت: بۆ بەسەربردنی ساتێکی خۆش با گاڵتەیەك لەگەڵ ئەو جوتیارەدا بکەینو پێڵاوەکانی لێ بشارینەوەو پاشان خۆمان لە پشت درەختەکانەوە حەشار بدەین، تا ببینین کاتێك لە پێڵاوەکانی دەگەڕێتو نایاندۆزێتەوە چۆن دەشڵەژێ؟

فەیلەسوفەکە وەڵامی دایەوەو وتی: نابێت لەسەر حسابی هەژارەکان دڵی خۆمان خۆش بکەین، ئەی بۆچی بە جۆرێکی دیکە ساتێکی خۆش بەسەرنەبەین؟ تۆ خوێندکارێکی زیرەكو دەوڵەمەندی، دەتوانیت بەهۆی ئەم پیاوە هەژارەوە زیاتر خۆشحاڵ بیت، لە بری ئەوەی پێڵاوەکانی لێبشارینەوە، هەر تاکێك لە پێڵاوەکانی سکەیەکی ئاڵتونی بخەرە ناو، پاشان خۆمان دەشارینەوە تا بزانین چەند کاریگەری دەبێت لەسەریو چەندە هەست بە خۆشحاڵی دەکات، بێگومان ئەو کاتەی تۆ شادی بە کەسێك دەبەخشیت خۆت شادمانترو خۆشحاڵتر دەبیت!

خوێندکارەکە فەرمانی فەیلەسوفەکەی جێبەجێکردو هەر تاکێك لە پێڵاوەکان سکەیەکی ئاڵتونی خستە ناوی، پاشان خۆیان لە پشت چەند دارێکی نزیکەوە شاردەوە، تا جوتیارەکە لە کاتی هاتنیدا نەیانبینێت، چاوەڕێیان کرد تا کاتێك جوتیارە هەژارەکە کارەکەی تەواو کردو گەڕایەوە بۆ لای چاکەتو پێڵاوەکانی..

لە کاتێکدا کە چاکەتەکەی لەبەردەکرد قاچی کردە ناو یەکێك لە پێڵاوەکانی، هەستی بە شتێکی ڕەق کرد، وەستاو دانەوییەوە سەیری ناو پێڵاوەکەی کرد سکەیەکی ئاڵتونی دۆزییەوە، لە خۆشیاندا خەریکبوو باڵی دەگرت، نەیدەزانی ئەوە خەوە، یان ڕاستییە، سەیری سکە ئاڵتوونییەکەی دەکردو بە دەستییەوە ئەم دیو ئەودیوی دەکرد، سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد، کەسی بەدی نەکرد، پارەکەی خستە گیرفانییەوەو تاکە پێڵاوەکەی تریشی لە پێکرد، ئەمجارەش هەستی بە خۆشی زیاتر کرد، کاتێك لە تاکە پێڵاوەکەی تریدا سکەیەکی هاوشێوەی بینی!

کەوتە سەر ئەژنۆو سەیرێکی ئاسمانی کردو بە دەنگی بەرز پاڕایەوەو سوپاسی خوای گەورەی کرد، کە تەنها خۆی دەزانێت کە چەند هاوسەرەکەی نەخۆشەو کەس نییە یارمەتی بدات، یان لە باروگوزەرانی منداڵەکانی کە بەبێ نان بەجێی هێشتوون، بە دەنگی بەرز دوعای دەکردو سوپاسی خوای گەورەی دەکرد، کە ئەم دوو سکە ئاڵتوونییەی لە شوێنێکەوە بۆ ناردووە، کە نازانێت خاوەنەکەی کێیە؟! کە فریای خێزانەکەی دەکەوێتو ڕزگاریان دەکات لە سەرماو سۆڵەی زستان..

ئەم دیمەنە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر خوێندکارەکە، هەتا وای لێهات چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك، مامۆستاکەی پێی گوت : "ئێستا هەست بە خۆشحاڵیو ئاسوودەیی دەکەیت، یان ئەو کاتەی گاڵتەت بە جووتیارەکە بکردایە؟

خوێندکارەکە وەڵامی دایەوەو وتی: وانەیەك فێربووم، کە هەرگیز لە یادی ناکەم!

ئێستا هەست بە کاریگەریو ڕاستی وشەگەلێك دەکەم، کە هەرگیز لەوەوپێش نەمدەزانی، ئێستا دەزانم کە زۆرترین خۆشحاڵیو بەختەوەریو ئاسوودەیی دەروونی مرۆڤ، ئەو کاتەیە کە دەبەخشێت، نەك ئەو کاتەی کە وەردەگرێت!

# کارگەی ورەبەرزی



ئا: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

شارلی شاپڵن شانۆکاری بەناوبانگ، لە یادەوەریەکانیدا بەمشێوەیە باسی چیرۆکی هاوڕێیەکی دەکات، ڕۆژێك بۆ سەردانی دەڕوات بۆ کارگەکەی، بینی وێنەیەکی گەورەی لە چوارچێوەیەکی گرانبەهادا لە نوسینگەکەی داناوە، وێنەی پیاوێك بوو کە شێوازەکەی نیشانەی توندو تیژیو لووتبەرزی بوو!

بۆیە پرسیاری لێکرد: ئایا ئەوە وێنەی باوکتە؟

وەڵامی دایەوە: نەخێر....

ئەوە خاوەنی کارگەیەکی ڕکابەری منە، ژیانی کرداری من وەکو فەرمانبەر لای ئەو دەستی پێکرد، نارەحەتیو تاڵی زۆری پێچەشتم!

بۆیە وێنەکەیم لە بەردەمی خۆم داناوە، تاوەکو بیرم خاتەوە ئەگەر بێتوو تەممەڵی بکەم، ئەوا دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەو بۆ کارکردن!!!

ڕووبەری ژاپۆن نزیکەی ١٧٪ ڕووبەری شانشینی عەرەبی سعودییە، ژمارەی دانیشتوانی ژاپۆن نزیکەی ١٣٠ ملیۆن کەسە، بە چڕییەك بڕەکەی دەگاتە ٣٣٧ کەس بۆ هەر کیلۆمەترێکی چوارگۆشە. نزیکەی سێ چواریەکی ڕووبەرەکەی دارستانی شاخاوییەو بۆ کشتوکاڵ ناشێت، بۆیە لە کەنارە ئاوییەکان دانیشتوان زۆرترن، لێرەوە ماسی دەبێتە خواردنی سەرەکی لە ژاپۆن.

بۆ زانینی ڕادەی گرنگی دانی ژاپۆنییەکان بە ماسی نزیکەی (٤٠) گۆڤاری زانستی ژمێردراون (کە زۆربەیان بە زمانی ژاپۆنین)، لێکۆڵینەوە دەربارەی ماسیو سامانی ماسی بڵاودەکەنەوە. هیچ زانکۆیەك لە ژاپۆن کۆلیجێك، یان بەشێکی تێدا نییە کە لەو بابەتە نەکۆڵێتەوە. بەڵکو زانکۆیەکی تایبەتمەند هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی ماسی، سەرەڕای ئەوانەش چەند لایەنێك هەن کە هاوکاری لێکۆڵینەوەکانی ئەو سامانە دەکەن، جێگەی سەرسوڕمان نییە کە ژاپۆنییەکان نزیکەی لە ١٥٪ سامانی ماسی لە جیهاندا ڕاودەکەنو بە پلەی دووەم دێن دوای چینییەکان.

لە پێگەی سوپای سەنگافۆرە لە تۆڕی ئینتەرنێت، ئەم چیرۆکەم دەربارەی ژاپۆنییەکانو حەزکردنیان لە گۆشتی ماسی تازە خوێندەوە: ماوەی دەیان ساڵ بوو ماسی لە کەنارە ئاوییەکانی ژاپۆن نزیك نەدەبوونەوە، بۆیە ژاپۆنییەکان هەستان بە چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتەو لە ناوجەرگەی دەریاو ئۆقیانۆس دوور لە کەنارەکان ڕاوەماسییان دەکرد.

لەگەڵ ڕۆژگار بەلەمەکانی ڕاوکردن گەورەتربوونو زیاتر لە کەنارەکان دوور دەکەوتنەوە، بەڵام ئەمە گەیشتنی ماسییەکان بۆسەر وشکانی دوادەخات، ئەوەش مانای ئەوەیە ماسییەکان بە تازەیی نامێننەوە!

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە کەشتییەکان لەگەڵ خۆیان بەفرخەرەوەو سەهۆڵگەیان هەڵدەگرت، دەستبەجێ دوای ڕاوکردنیان ماسییەکانیان تێدا دادەنا، ئەمەش بووە هۆی گەورەبوونی قەبارەی کەشتییەکان، بۆیە زیاترو زیاتر لە کەنارەکان دوور دەکەوتنەوە، بەمەش ماوەی مانەوەی دوور لە کەنارەکان زیاتر بوو، ئاخۆ لێرەدا کێشەیەك هەیە؟

بەڵێ! ئێستا ماسییەکان تازە نین! چونکە خراوەتە ناو بەفرخەرەوەو سەهۆڵگەوە، خەڵکی بە شێوەیەك تەماشای ماسییەکان دەکەن کە بەستوەو تازە نییە! بۆیە نرخی ماسییەکان دابەزی! کێشەکە لەوەدا چییە؟ کێشەکە ڕوونو ئاشکرایە، نرخی کەم دەبێتە هۆی ئەوەی ماسی زیاتر هاوردەی بازاڕ نەکرێت! ئەی چارە چییە؟

ژاپۆنییەکان هەردەم چارەسەریان لایە! هەستان بە هەڵگرتنی حەوزی گەورەی پڕ ئاو لە ناو کەشتییەکانی ڕاوکردن، ماسییەکانیان تێدا دادەنا، بە زیندوویی دەمانەوە تا دەگەیشتنە کەنار، ئەوسا دەریان دەهێنان بۆ فرۆشتن! بێگومان ئەمە بیرۆکەیەکی زیرەکانەیە، بەڵام دوای ئەوە چی ڕووی دا؟ بۆیان دەرکەوت کاتێك ماسییەکان دەگەنە کەنار هەست بە تەممەڵیو سستی دەکەن! چونکە ماسییەکان لە ناو حەوزەکە قەرەباڵغیان دروستکردووەو وەکو ناو دەریا جمەوجۆڵ دەکەن، لەوێدا بەو شێوەیە ناجوڵێنەوە! بەم پێیە تامو چێژی ئەم ماسیانە جیاواز دەبێت لە تامو چێژی ماسی تازەڕاوکراو! ئەو ژاپۆنیانە چین؟ ئەوانە هیچ کات دەستەوسان نابن، هەمیشە بیرۆکەی نوێو چارەسەری گونجاویان پێیە! هەستان بە دانانی بەچکەی بچوکی ماسی قرش لە ناو حەوزەکە! بۆچی؟ بۆ ئەوەی ماسییەکان لەناو حەوزەکە لە جوڵە نەوەستنو هەردەم لە ترسی ماسییە قرشەکان ڕابکەن!

ئەو بەرەنگاربوونەوەی ماسییەکەی تێدا دانرا، وایکرد هەمیشە بجوڵێتەوەو بە خێرایی ڕابکات لە پێناو مانەوەی لە ژیاندا! ڕاوچییەکانیش ئەوەیان دەویست، کاتێك دەگەیشتنە کەنار، ماسییەکان تازەو زیندوو بنو تامو چێژیان خۆشبێت، بێگومان قرشەکان هەندێ لە ماسییەکان دەخۆن، بەڵام ئەوەی دەخورێ ڕێژەیەکی کەمەو شایانی باس نییە.

ئاخۆ ئەو سستیو تەممەڵییەی دووچاری ماسییەکان بووە لە ناو حەوزەکەدا تووشی ئێمەش بووە؟ ئێمەی مرۆڤ، کاتێك لەبەردەم بەرەنگارییەکاندا ناژین؟ ئایا ئەو بەرەنگارییانەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە وامان لێدەکەن لە کارەکانماندا چالاك بین؟ ئایا بەرەنگارییەکان لە چالاکی بەردەوام دەمان هێڵنەوە؟

بێگومان سەرکەوتن لە ژیانی سووکو سانا نایەتەدی، کە بەرەنگاری تێدا نییە! با هەموو ئەو شارەزاییو هێزو تواناو سەرچاوانەی خوای گەورە پێی بە خشیوین بەکاریانبهێنین، تاوەکو کارێکی جیاواز بکەین لەوەی سستو تەممەڵەکان ئەنجامی دەدەن.

با هەر یەکێ لە ئێمە، بەچکە ماسی قرش لە دوای خۆی دابنێ، ئینجا تەماشابکات، تا چ ئاستێك لەم ژیانەدا بەرەو پێشدەچێت!

هەربۆیە هەڵوێستی قورس، ورەبەرزی دروستدەکات!



شاگوڵ عوسمان

# گۆڤاری بڕیار.. لە پێشەنگی ئەوانی تردایە..

مرۆڤ کاتێك لە کارێکدا سەرکەوتوو دەبێت خوشحاڵ دەبێت، بەڵام خۆشحاڵتر دەبێت گەر کارو پرۆژەکەی بەردەوامی هەبێتو پاشان ئەنجامەکەی کاریگەری زۆر دروستانەو بە مەودایەکی دورودرێژتر بە ئاسۆی ڕوونی کارەکەی ببینێت، جا ئەگەر ئەمە دەزگایەك بێت، یان کۆمەڵە کەسانێك بن، ئامانجیان کۆکردبێتەوە بۆ خزمەتێکی بەردەوامی زۆرتر، خواستی مانەوەیان پێدەدات.

ویستم لە ساڵیادی گۆڤاری بڕیاردا پەیامێك بنووسم، بەڵام دەمزانی خودی خۆم وەك خوێنەرێك خۆشەویستیو متمانەیەکی زۆرم لەسەر ئەم گۆڤارە هەیە، بەڵام نەمدەویست ئەو متمانەی لای خۆمە گشتاندنی بۆ بکەم، بەسەر گشت خوێنەرو گۆڤارەکانی تردا، لەبەرئەوە هەوڵمدا، ئەم ڕاستییە بخەمەڕوو، بەڵام بەڵێنم دا، حەزو ویستی خۆم بخەمە لاوەو کارێك بکەم وەك کەسێکی سەربەخۆو بێ لایەنگری، تابزانین چ گۆڤارێك لە پێشەنگی ئەوانی تردایە، ئەو ڕاستییە بۆ چ گۆڤارێك دەردەچێت..

بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژێکم تەرخانکرد، گۆڤارەکانم پۆلێن کرد، بەپێی بابەتەکانو پێناسەیان، کە چەند بەشێك لە خۆدەگرێت، گۆڤاری سیاسی، گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی، گۆڤاری هونەری، گۆڤاری منداڵان، گۆڤاری بواری ئەدەبیات، گۆڤاری ئاینی، گۆڤاری خێزانو کۆمەڵگە، گۆڤاری زانستیو گۆڤاری بابەتی هەمەڕەنگو ...هتد.. لەم نێوەندەدا کارم لەسەر گۆڤارەکانی بواری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی دەکرد، چەند پرسیارێکم ئامادەکردبوو کاتێك سەردانی کتێبخانەو کۆشکەکانی فرۆشتنی ئەم گۆڤارانەم دەکرد.. دەگەڕامو کۆم دەکردنەوە، پرسیارەکانم بەمشێوەیە ئاڕاستە دەکرد: لە کوردستاندا چەند گۆڤاری بواری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی هەیە؟ کامیان خواستی زۆرترین خوێنەری لەسەرە؟ لەگەڵ ئەوەی ئایا تیراژیان لێی دەمێنێتەوە، یان نا؟ هەرچەند خودی خۆم نەکەسێکی ئەکادیمیم، نە خاوەن ئەزمونێکی زەمەنی ڕۆژنامەوانی دورودرێژم هەیە، بەڵام کاتێك وەڵامەکانم دەبیست، ئەوسا کەسانێکی زۆر ئاسایی دەیانتوانی ئەو پێشەنگییە درك پێبکەن، کە نموونەو پێشەنگی سەرجەم گۆڤارەکانی ئەم بوارە، باسو خواسی چ گۆڤارێك بوو..

بە سوپاسەوە ئەو بەڕێزانە باسیان لەوە دەکرد هەموو خوێنەرێك دەتوانێت تایبەتمەندی خوێندنەوەی خۆی لە گۆڤارەکاندا بدۆزێتەوە، گۆڤارەکانیان پێناسە دەکردو دەیانگوت: هەندێ لە گۆڤارەکان بابەتەکانیان دیاریکراو نییە، زۆر بە زمانێکی شاراوە دەدوێن، هیچ تایبەتمەندییەکی کەسی تیادا نابینرێت، هەندێکیان وا پێناسە دەکرێن کە سێ بەشی گۆڤارەکە ڕیکلامەو بەشێکی بابەتی تێدا بڵاوکراوەتەوە، زیاتر لە گۆڤارێکی بازاڕی دەچێت، تا یەکێك لە گۆڤارەکان نرخی ئەمجارەی زیاتر بوو لە جارەکانی تر، لەبەرئەوەی ڕیکلامی

زیاتری هەبوو، هەندێکی تریشیان بابەتەکانیان هاوشێوەی گۆڤارەکانی پێشینەی خۆیانە، پێناسەیەکی تری گۆڤارەکە بریتی بوو لە کارکردن بۆ هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵگا، گەر لە ڕوانگەی ئەو گۆڤارانەوە چینەکان بخوێنینەوە تەنها باسی لە سێ کەسایەتی سیاییو شەش هونەرمەندو چەند بابەتێکی تری هەمەچەشنە دەکرد، پاشان هەندێ لە گۆڤارەکانی تر شەوان لە نێو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن چ باس بێت، بە ڕۆژ ئەوان لە نێو گۆڤارەکانیاندا تایبەتمەندی وەردەگرێت، هەندێ لە گۆڤارەکان باسو خواسیانو سەرقاڵیان شتگەلێکن، کە هیچ پێویستییەکی تێدانییە بۆ خوێنەر، هەندێکی تر لە گۆڤارەکان لەو چوارچێوەی ویستیان هەیە بۆ کارکردن، هەر لەسەرەتاوە ونیانکردووە.

ئەو گۆڤارەی ناوی دەبرێت لە پێشەنگەکانداو زۆر بە متمانەوە دەیانگوت: (گۆڤاری بڕیار)، خواستی زۆرترین خوێنەری لەسەرەو خوێنەرەکانی بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی دەرچوونی ژمارەی نوێی دەکەنو هەوڵدەدەن بەدەستی بێنن، باسیان لە گۆڤاری بڕیار دەکردو دەیانگوت: گۆڤاری بڕیارو هاوشێوەکانی، وایان باسو خواس دەکرد کە پێشەنگی گۆڤارەکانی کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆییە، باسیان لەوە دەکرد کە گۆڤارێکی پەروەردەیی تاکەو تایبەتمەندی هەیەو باسی مرۆڤێك دەکات گەر لەماڵەوە بێت، یان لە کاردا بێت، یان لە بازاڕ، یان خاوەنی پەروەردەیەکی دروست بێت بۆ منداڵەکان، یان خواستی ڕاستەقینەی خودی بێت، هەوڵدەدات خوشحاڵت بکاتو خۆشبەختیت تێدا بدۆزێتەوەو تواناکانت پەرەپێبدات، بتکاتە کەسێکی خاوەن ئامانجو ئەزمون، هەوڵی فێرکردنت دەداتو تایبەتمەندیت دەداتێ، بە پێچەوانەی ئەوانی تر کە هەر زانیارییەو بەس.

بە خۆشحاڵییەوە پێمخۆش بوو ئەم ڕاستییەو تایبەتمەندیو سەرکەوتنە بۆ گۆڤاری بڕیار بخەمەڕوو، لە ناخەوە پیرۆزبایی ئەو پێشەنگییەیان لێبکەم، بەڕاستی شایەنن، خودا شایەنی زیاترتان بکات، دڵنیام خۆشحاڵن کە ڕکابەر هەیە، چونکە کاتێك کارێکی باش بوونی هەیە، کێبەرکێ لەسەر باشترەو لە قازانجی خوێنەردایە، دەستخۆشیو پیرۆزبایی لە سەرجەم ستافی گۆڤاری بڕیار دەکەم، ئێوە خاوەنو دەستەی کارێکن دوای کارکردنی چوار ساڵ، لە پێشەنگی ئەوانی تردان، هیوای کاری باشترو پێشەنگی زیاترتان بۆ دەخوازین، هەردەم لەشساغو سەرکەوتووبن، پیرۆزبایی ئەو پێشەنگییە لە خوێنەرانی بڕیاردەکەم، پیرۆزبایی لە خودی خۆیانو لە خێزانەکانیانو لە شوێنی کارکردنو لە بازاڕەکانو لە نەخۆشخانەو پەروەردەی منداڵەکان...هتد، دەکەم، داوا لە خودای باڵادەست دەکەم، زیاتر سەرکەوتووتان بکات لەسەر ئەم بەرپرسیاریەتەی گرتوتانەتە ئەستۆی خۆتان، مایەی خێرو چاکەی زیاتر بێت بۆ کۆمەڵگاو نیشتمانەکەمان، بە هیواین ئاوەدانی زیاتر ڕووبکاتە هەموو بنەماکانی ئەم وڵاتە، هیوامان پێتانە، خودا زیاتر دەستی خێرو چاکە ببەخشێت بە هەموولایەك.

م. محەممەد/ چۆمان



# بۆ ساڵیادی (بڕیار)

ساڵیادت پیرۆز گۆڤاری بڕیار
گۆڤاری ژیانو گۆڤاری ژیار
ساڵیادت پیرۆز هەزارەها جار
هەتوان بۆ ناخی سەرتاپا ئازار
گۆڤاری بڕیار هاوڕێی هەمیشەم
ڕێکخەری ژینو ڕەفتارو پیشەم
نەواو سێبەری جەستەی شەکەتم
هەوێنی وزەو تواناو هیمەتم
دیوەخانەکەی پڕ لە خۆشخوانی
هەناسەی ژینی ئاواتو جوانی
ئەی ناڵەشکێنی نرکەو ناڵەکەم
هاوڕێو هاودەمی ماڵو حاڵەکەم
باغی پڕسەمەر پڕ بۆنو عەنبەر
بۆ ناخی زامار، هەتوان چارەسەر
ئەستێرەی گەشی ئاسمانی ڕەشپۆش
هەگبەی پڕ جوانی پڕ جۆشو خرۆش
پێشەنگی گەشەی مرۆڤایەتی
لە مەملەکەتی پڕ نەهامەتی
پیرۆزە دیسان ساڵیادی بوونت
هەر گەشاوەبێت، بیروبۆچوونت

# زیرەکی پیاوان

## قازی ژنی دووەم دەهێنێت..

قازی شاری (...) دەڵێت: بە نهێنیو بەبێ ئاگاداری خێزانی یەکەمم، ژنی دووەمم هێنا، دوای ماوەیەك خێزانی یەکەمم بەبێئەوەی هیچ بەڵگەیەکی هەبێت هەستی کردبوو، بۆیە هەرجارێك پێداگری دەکردو باسی لە گومانەکەی خۆی دەکرد، قەناعەتم پێدەکرد کە ئەوە خەیاڵەو وەهمە چووەتە دەروونتەوە.

لەبەرئەوەی ڕۆژانە ئەم بابەتەی دەوروژاند، ڕێککەوتم لەگەڵ خێزانی دووەممدا کە پێکەوە پلانێك دابنێین، بۆئەوەی قەناعەتی پێبکەین، بۆجێبەجێکردنی پلانەکە ڕۆژێك خێزانی دووەمم لە کاتی نوێژی نیوەڕۆدا دەڕوات بۆ ماڵی خێزانی یەکەمم، بە خێزانی یەکەمم دەڵێت: سەبارەت بە کارێك کە بۆم هاتۆتەپێش، دەمەوێت ڕاوێژ بە جەنابی قازی بکەم..

خێزانی یەکەمم، زۆر بەڕێزەوە بەخێرهاتنی دەکاتو پێشوازی لێدەکات بۆ ژووری میوانو پێی دەڵێت: چاوەڕێ بکە، کەمێکی تر قازی دەگەڕێتەوە، کاتێك گەڕامەوە ماڵ، خێزانی یەکەمم هەواڵی پێدام کە ئافرەتێك لە ژووری میوان چاوەڕوانم دەکات.

لەگەڵ خێزانی یەکەمم چوومە ژوورەوە بۆ لای خاتوونی میوان، پاش بەخێرهاتن گوێم بۆ وتەکانی گرت، خاتوونی میوان وتی: بەڕێز جەنابی قازی، من هاوسەرێکم هەیە کە زۆر خۆشمدەوێتو دڵنیاشم کە ئەویش خۆشیدەوێم، بەڵام لەم ڕۆژانەی دواییدا هەستێکی سەیرم سەبارەت بە هاوسەرەکەم بۆ دروستبووە، لە ڕاستیدا واگومان دەبەم کە ئەو بەبێ ئاگاداری من ژنی دووەمی هێناوە، هەرچەندە دەمەوێت لەو بارەیەوە لەگەڵیدا بدوێم، بەڵام ئەو هەرپێداگری دەکاتو قەناعەتم پێدەکات کە ئەو گومانە، تەنها خەیاڵو ئیرەییە..

ئیدی هەرکات ئەم بابەتەی لەگەڵدا دەوروژێنم، لەبەرئەوەی من ئارامم لێبڕاوەو حەزناکەم هاوسەرەکەم جگە لە من خێزانێکی دیکەی هەبێت، بەڵام ئەو قەناعەتم پێدەکات کە ئەوە تەنها خەیاڵەو لە ڕاستییەوە دوورە.

دوای ئەوەی ئافرەتەکە، کە لە ڕاستیدا خێزانی دووەممە، بەڵام لای خێزانی یەکەمم میوانێکی نامۆیە، لە قسەکانی بووەوە، گوتم: بێگومان هاوسەرەکەت ڕاستدەکات، ئەوە وەسوەسەیەکە لە وەسوەسەکانی شەیتان، ئەوە شەیتانە دەیەوێت نێوانی هاوسەران تێکبداتو خانەو لانەیان لێ بشێوێنێت، گومانو دوودڵی لە دەروونی خۆت وەدەربنێ.

پاشان گوتم: جابۆچی دوور بڕۆین، ئەم خێزانەی من، (ئاماژەم بۆ خێزانی یەکەمم کرد)، هەمیشە لە دوودڵیدایە، واخەیاڵ دەکات کە من خێزانی دووەمم هێناوە.

هەرکات قسەی بۆ دەکەمو بەڵگەی بۆ دەهێنمەوە، قەناعەت دەکات، بەڵام پاش کەمێکی تر بە هەمان شێوەی پێشوو دەگەڕێتەوە بۆ سەر وەسوەکەیو دووبارە هەمان بابەت درێژە پێدەدات.

جا بۆئەوەی ئەم خێزانەی منیش وەسوەسەکەی لە دڵدا نەمێنێو چیدی لە گومانو دڵەڕاوکێدا نەژی، ئەوا لە بەردەمی تۆداو بەشایەتی تۆ، دەڵێم: ئەگەر هەر خێزانێکم هەیە لە دەرەوەی ئەم ژوورە، ئەوا (تەلاقمدا)!!!

خێزانی یەکەمم خەریکبوو لە خۆشیدا باڵی دەگرت، لە خۆشیدا دەستو ئەژنۆی ماچ دەکردم، پاشان وتی: ئیدی هەرگیز ناهێڵم شەیتان فریوم بداتو هەرگیز جارێکی تر ناگەڕێمەوە سەر گومانو دوودڵی.

پەیام



و: چیا عەبدوڵ



# پێکهاتەی توانەوەی خەم

لە ئەفسانەیەکی سینیدا دەگێڕنەوە ژنێك لەگەڵ کوڕە تاقانەکەیدا زۆر بە بەختەوەری دەژیان، تا ئەو کاتەی مەرگ یەخەی کوڕە تاقانەکەی گرتوو، ڕۆژی تەواو بوو، دایکی بە تەنها مایەوە بە مەرگی کوڕەکەی دایکەکە زۆر دڵتەنگ بوو، بەڵام چۆکی دانەدا، ڕۆیشت بۆ لای حەکیمی گوندەکەیانو داوای لێکرد پێکهاتەیەکی پێ بڵێ تا ژیان بۆ کوڕەکەی بگەڕێنێتەوە، چەندە بەزەحمەتیش دەستبکەوێت ئەو بەلایەوە گرنگ نییە، حەکیمەکە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو کەمێك بیری کردەوە، پاشان وتی: تۆ داوای پێکهاتەیەك دەکەیت، باشە برۆ یەك دەنك خەردەلم بۆ بهێنە لە ماڵێکدا، کە هەرگیز خەمو خەفەتی بەخۆیەوە نەدی بێت.

ژنە بەوپەڕی هیممەت بەرزییەوە ڕۆیشت، تا ئەو شتە بەدەستبهێنێت، یەکەم دەرگا کە لێیدا ژنێکی گەنج هاتە دەرەوە، ژنەکە لێی پرسی ئایا ئەم ماڵە هەرگیز خەفەتی بەخۆیەوە دیوە؟

خاوەن ماڵ: بەزەردەخەنەیەکی پڕ لە خەمەوە سەیرێکی کردو وتی: جائەم ماڵە جگە لەخەم هیچی تری بەخۆیەوە بینیوە؟

ئیتر دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانیو وتی: هاوسەرەکەم ساڵێك لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد، چوار منداڵم بەسەردا بەجێماوە، هیچ شتێکم نییە تا بژێوی ژیانیان دابین بکەم، جگە لە فرۆشتنی شمەکی ماڵەکەمان، دایکی کوڕە تاقانەی کۆچکردوو، بەبیستنی ئەو چیرۆکە زۆر خەمباربوو، زۆر هەوڵی دا تا کەمێك لە خەمەکانی کەم بکاتەوەو دڵی بداتەوە، تا لە کۆتاییدا بوون بە هاوڕێ، ئەو ژنە پێی خۆش نەبوو بڕوات تاپەیمانی ئەوەی لێوەرگرت، کە جارێکی تریش بێتەوە بۆ سەردانی، چونکە ماوەیەکی زۆر بوو کەس لە دەرگای نەدابوو، کەسێکیش نەبوو تا دڵی خۆی لابکاتەوە، پێش خۆرئاوابوون لە دەرگای ماڵێکی تری دا، تادەنکە خەردەلێك بەدەستبهێنێت، لە ماڵێکدا هەرگیز خەمی نەبینیوە، بەڵام ئەمجارەش توشی خەفەت بووەوە، بە هۆی ئەوەی کە زانی لەم ماڵەدا گەورەکەیان، واتە باوکیان نەخۆشەو دایکی ئەو منداڵانەش خواردنێکی واشك نابات بیدات بە منداڵەکانی، لەم کاتەدا بیری لەوە کردەوە، چۆن هاوکاری ئەو ماڵە بکات، لەبەرئەوە بەپەلە خۆی گەیاندە بازاڕو بەو بڕە پارەیەی کە پێی بوو خواردنی بۆ ئەو ماڵە کڕیو خێرا گەڕایەوە بۆ لایانو هاوکاری ژنەکەشی کرد لە ئامادەکرنی خواردنێك بۆ منداڵەکانی، پاشان بەو هیوایەی بۆ ڕۆژی دواتر سەردانیان بکاتەوە، ماڵئاواییان لێکرد، بۆ ڕۆژی دواتر ژنە دیسانەوە دەستی کردەوە بە گەڕان، دەرگا بەدەرگاو ماڵ بەماڵ، گەڕانەکەی درێژەی کێشا، بەڵام بەداخەوە ئەو ماڵەی نەدۆزییەوە کە هەرگیز خەمی بەخۆیەوە نەدیوە، بۆئەوەی ئەو دەنکە خەردەلەیان لێوەربگرێت کە کوڕەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ژیان، بەڵام چونکە خاوەنی دڵێکی نەرمو باش بوو، کاتێك دەچووە هەر ماڵێکەوە هەوڵی دەدا هاوکارییان بکات، یان کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکات، بەشداری خۆشیو ناخۆشییەکانیانی دەکرد، بەتێپەڕبونی کات ئەم ژنە بوو بە هاوڕێی هەموو ماڵەکانی ئاواییەکە، بە تەواوەتی ئەوەی لە یادچوو کە بۆی دەگەڕا، ئەویش بەدەستخستنی دەنکە خەردەلێك بوو لە ماڵێکدا کە هەرگیز خەمی بەخۆیەوە نەدیوە، لەبەرئەوەی لە کێشەو هەستو نەستی ئەوانی تردا خۆی بیرچوو، درکی بەوەش نەکرد کە حەکیمی گوندەکەیان باشترین پێکهاتەی دایە بۆ لەناوبردنی خەمەکانی، گەر ئەو دەنکە خەردەلەشی دەستنەکەوێت، ئەو پێکهاتە سیحرییەی بەڕاستی بەدەستهێنا، ئەو کاتەی کە لە یەکەم دەرگای گوندەکەیانی دا. (لەگەڵ دڵخۆشەکاندا پێکەنیو لەگەڵ دڵتەنگەکانیشدا گریا)!

ئەم چیرۆکەش بۆ دەرچونمانە لە من منەی کە تێی کەوتوینو تیایدا ونبوین، بانگهێشتێکە بۆ دەرچونمان لەو بارەو دیسانەوە تێکەڵاو بونمانەو بەشداری کردنمانە بەدەوروبەر، بەمەش خۆشییەکانمان زیاد دەکەینو لە کاتی دڵتەنگیشماندا خەمەکانمان کەمتر دەکەنەوە، لەگەڵ ئەم بەشداریەشدا سودێکی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەرئەوەی بتکاتە کەسێکی بەختەوەر.



# کەسایەتیت تاقیبکەرەوە

١- ئەگەر لە دارستانێکدا بوویت، ئەمجۆرە پەرداخانەت بینی، کە پڕ لە ئاو بوون، کامیان هەڵدەبژێریت؟

أ- زیو. ب- دارین. ج- ئاسن. د- کریستاڵ.

٢- ئەگەر بە بەرزییەکەوە ئەم وێنانەت بینی، حەزدەکەیت سەیری کامیان بکەیت؟

أ- پشیلە. ب- دەریا. ج- دارستان. د- ئاژەڵی دڕندە.

٣- ئەگەر تۆ لە دارستانێکدا بوویت، چاوت بە پیرەپیاوێك کەوت، سڵاوی لێدەکەیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر.

٤- ئەگەر چیایەکی بەرزی سەوزت بینی، حەزدەکەیت پێیدا سەربکەویت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر.

٥- یەکێك لەم ئاژەڵانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

أ- کەروێشك. ب- شێر. ج- ئەسپ. د- پشیلە.

هـ- کوندەپەپوو. و- تاووس.

٦- یەکێك لەم شێوانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

أ- چوارگۆشە. ب- بازنە. ج- لاکێشە.

٧- بەپێی چاکی ئەم ئاژەڵانە ڕیز بکە..

أ- ئەسپ. ب- مەیموون. ج- مانگا. د- هەنگ.

٨- یەکێك لەم وشانە هەڵبژێرە:

أ- قاوە. ب- سەگ. ج- دەریا. د- پشیلە. ە- کۆتر.

وەڵام..

١-أ-زیو: تۆ مرۆڤێکی هەستیاری، بە ئاسانی کارت لێدەکرێت.

ب-دارین: تۆ لە دەرەوە مرۆڤێکی بەهێزیت، لە ناوەوە لاوازیت.

ج- ئاسن: تۆ خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێزیت، پتەوو داڕێژراویت، هیچ شتێك نات لەرزێنێت.

د- کریستاڵ: تۆ مرۆڤێکی شەفافو ناسکیت، حەزت لە درۆ نییە، زۆر هەستیاریت، تێڕوانینت بۆ ژیان جوانە، حەزیش بە جوانی دەکەیت.

٢- پشیلە: مرۆڤێکی نموونەیی.

ب- دەریا. مرۆڤێکی سەرکەشو کەللەڕەق.

ج- دارستان: مرۆڤێك کە حەز بە چاکە دەکات.

د- ئاژەڵی دڕندە: مرۆڤێکی بەهێزو ئازا.

٣- أ- بەڵێ.. واتە لە مردن ناترسیت.

ب- نەخێر: واتە لە مردن دەترسیت.

٤- أ- بەڵێ: واتە مرۆڤێکی گەشبین بە ژیان.

ب- نەخێر: واتە مرۆڤێکی ڕەشبین بە ژیان.

٥- أ- کەروێشك: مرۆڤێکی زۆر زیرەك.

ب- شێر: مرۆڤێك کە خاوەنی سیفەتی خراپە.

ج- ئەسپ: مرۆڤێکی ڕەسەن، خاوەنی هەستێکی بەهێز، بەهێز لە ڕقو خۆشەویستیدا.

د- پشیلە: مرۆڤێکی سۆزدار، زۆر حەزی بە ژیانە.

هـ-کوندەپەپوو: مرۆڤێکی بەخیل.

و- تاووس: مرۆڤێکی لە خۆبایی، حەز بە بریندارکردنی کەسانی تر دەکات.

٦- أ- چوارگۆشە: حەز بە ڕێکخستنو ڕێکوپێکی دەکات، بەڵام لە کەسایەتیدا ناتەواوییەك هەیە.

ب- بازنە: هەمیشە شکست دەخاتە پاڵ کەسانی تر، حەز بە کارکردن ناکات.

ج- لاکێشە: حەز بە ڕێکخستنو ژیانێکی ڕێکو پێك دەکات.

٧- أ- ئەسپ: خاوەنی دەروونبەرزی.

ب- مەیموون: حەز لە ماڵو سامان دەکات.

ج- مانگا: کەس‌وکاری خۆشدەوێت.

د- هەنگ: حەز بە کارکردن دەکات.

٨- أ-قاوە: حەز بە هاوسەرگیری دەکاتو هەمیشە بیری لێدەکاتەوە.

ب- سەگ: خەڵکی خۆشیان دەوێت.

ج- دەریا: دنیای خۆشدەوێت.

د- پشیلە: خۆی خۆشدەوێت.

ە- کۆتر: کەسێکی خۆشدەوێت، بەڵام لە بەیەك گەیشتندا ئینکاری دەکات..

نا: محەممەد هاشم محەممەد




# بڕیار لە زاری خوێنەرانییەوە

- بڕیار، لە خەمو خەفەتو دڵەڕاوکێو بێزاریو ڕەشبینی دووردەخاتەوە.
- بڕیار، لایەنە جوانەکەی ژیانت بۆ دەردەخات، وات لێدەکات کە لایەنی ئەرێنییەکەی ژیان پەیڕەو بکەیت.
- بڕیار، دڵخۆشت دەکاتو ئارامیت پێدەبەخشێتو دامەزراوت دەکات.
- بڕیار، دەتوانی بیبەیتەوە بۆ ماڵەوەو هاوڕێ لەگەڵ خێزانو منداڵەکانت بیخوێنیتەوە، بە پێچەوانەی هەندێك گۆڤار کە زۆرجار مرۆڤ شەرم دەکات بە دەستییەوە بگرێت،ج جای ئەوەی بیباتەوە بۆ ماڵەوە.
- بڕیار، بۆ هەموو کاتو ساتێك دەگونجێت، بابەتەکانی بەسەرناچن، ژمارە کۆنەکانو تازەکانی وەك میوەهات وایە، هەر یەکەو تامی خۆی هەیە.
- بڕیار، پێویستە هەموو کەسێك وەك ئەرشیفێك لە ناو کتێبخانەکەیدا هەبێت، سەرچاوەیەکی پاکە بۆ پەروەردەی خێزانو کۆمەڵگە.
- بڕیار، تا ئێستا بابەتێکی نارێكو بریندارکەری بڵاو نەکردۆتەوە، کە ئازاری لایەنێك، یان کەسێکی تێدابێت.
- بڕیار، زۆر بە جوانی زۆربەی کێشەکان دەخاتەڕوو، چارەسەریشی بۆ دادەنێت، هەروەها ڕەخنەی بونیاتنەریش دەگرێت، بەڵام زۆر بە بەرپرسانەو خۆی لە کۆمەڵگە جیانەکردۆتەوە.
- بڕیار، زۆر لە کێشە خێزانییەکانی چارەسەرکردووە، هەندێجار کێشەی لێکجیابوونەوەی هاوسەرانی سارێژکردووە.
- بڕیار، دایكو باوکی فێرکردووە کە چۆن پێویستە لەگەڵ منداڵەکانیاندا بدوێنو چارەسەری کێشەکانیان بکەنو ڕێز لە هەڵسوکەوتو مافەکانی نەوەی دوارۆژ بگرێت.
- بڕیار، فێری کردووین کە چۆن ڕێز لە دایكو باوکمان بگرینو تا ماوین ماندوبوونیان لە یاد نەکەینو خزمەتیان بکەین.
- بڕیار، بۆ هەموو تەمەنێك گونجاوە، (منداڵو پیاوو ئافرەتو بە تەمەنو مامۆستاو کرێکارو ... هتد)، هەروەها هەموو چینەکانی کۆمەڵگا بە بێ جیاوازی دەتوانن سوودی لێوەربگرن.
- بڕیار، گۆڤارێکە ناتوانین دەستبەرداری بین، چونکە وەکو چرایەك ڕێگامان بۆ ڕووناك دەکاتەوە.
- بڕیار، لەناو گۆڤارەکاندا دیارەو شوێنی خۆی لە دڵی خوێنەردا کردۆتەوە، وەکو چۆن مارکەیەکی جیهانی کە هەرکەسێك بیەوێت بیکرێت، ئەوا بە بێ سێو دوو، بەبێ دوودڵی بەچاونوقانەوە دەیکرێت، چونکە پێشتر خوێندویەتییەوە.
- بڕیار، باشترینو جوانترین دیارییە کە بتوانیت پێشکەشی خۆشەویستانو دۆستانتی بکەیت.
- بڕیار، پاکەو تەنها باسی ڕەوشتو بەهای بەرزو جوان دەکات، ئەو ئاکارو ڕەوشتانەی کە هەموو مرۆڤەکان (بە بێ جیاوازی ڕەگەزو ئاینو ئایدۆلۆژیا) تیایدا بەشدارن، باسی دەکاتو دەیخاتە ڕوو.
- بڕیار، وا لە مرۆڤەکان دەکات کە هەست بە بەرپرسیارێتی بکەنو خۆیان بخەنە ناو هاوکێشەی چارەسەرەوە، نەك تەنها ڕابوەستنو لە دوورەوە سەیری کێشەکان بکەن.
- بڕیار، وا لەمرۆڤەکان دەکات پەیوەندییان لەگەڵ پەروەردگاریان توندوتۆڵ بێتو کێبڕکێ بۆ بەدەستهێنانی خۆشبەختی دونیاو قیامەت بکەن.
- بڕیار، فێرت دەکات کە چۆن مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بکەیتو کێشە گەورەکان چارەسەیان بەلاتەوە زۆر ئاسن بێت، (نیسکێك نەکەیت بە گیسکێك) بەگفتوگۆو تێگەیشتن بڕیار بدەن بۆ دروستکردنی بەختەوەری لە ناو خێزاندا، ئەو سیفەتانەی کە هەردوولا حەزدەکەن لە بەرامبەرەکەیاندا هەبێت چین؟ چۆن یەکتریان خۆشبوێت؟
- بڕیار، فێرت دەکات کە خودپەسەند نەبیتو دەوروبەرت خۆشبوێتو هەوڵبدەیت لای هەموان خۆشەویست بیت.
- بڕیار، فێرت دەکات کەسێکی چاکەکارو کاریگەر بیت، لەناو کۆمەڵگەداو کەسێکی دووربیت لە گەندەڵی.
- بڕیار، چیرۆکەکانی زۆر خۆشو کاریگەرن، چونکە هەر چیرۆکێك کۆمەڵێك ڕەوشتی بەرز دەخاتە ڕوو، چیرۆکیش لە یادناچێت.
- بڕیار، فێری کۆمەڵێك ئەتەکێتی جوانمان دەکات، لە ماڵو قوتابخانەو شوێنەگشتییەکانو شوێنە فەرمییەکان، ڕێزو بەرزییەك دروستدەکات لە نێوان مرۆڤەکاندا.
- بڕیار، هێڵێکی ڕاستت بۆ دەکێشێتو دەتوانی لەسەری بڕۆیتو بەردەوام بیتو کەسێکی سەرکەوتووبیت لە ژیاندا.
- بڕیار، پێتدەڵێت چۆن دەتوانیت شتومەكو کاڵاکان بکڕیتو مامەڵەی دروستت نیشاندەدات.
- بڕیار، فێرمان دەکات کە کات لە زێڕ گرنگترە، چونکە زێڕ دەتوانیت جارێکی تر بەدەستی بهێنیتەوە، بەڵام چرکەکانی کاتژمێر بەهیچ هێزێك ناگەڕێتەوەو بەدەست نایاتەوە.
- بڕیار، فێرت دەکات کە بەڕێوەبەر چۆن مامەڵە لەگەڵ فەرمانبەرو قوتابییەکانی بکات، بە پێچەوانەوە کە چۆن فەرمانبەرو قوتابی هەست بە بەر پرسیارێتی بکەن.

ئەمانەو زۆر شتی تر، وتراوە دەربارەی گۆڤاری بڕیار، کە لێرەدا ناتوانین هەمووی بخەینە ڕوو، بەڵام وەك وتراوە: (ئەمە مشتێکە لە خەرواری).



# ژیان فێری کردم

ژیان فێری کردم

لە نەخۆشییەکانی ئەم شارستانییەتە ئەوەیە، فێڵو تەڵەکە ناودەنێن زیرەکی، لێکهەڵوەشانی کۆمەڵگە ناودەنێن ئازادی، خراپەکاری ناودەنێن هونەر، ئیستغلالیش ناودەنێن هاوکاری..

ژیان فێری کردم

کاتێك مرۆڤ بەرامبەر گیانداران بە بەزەییە، بەڵام بەرامبەرخودیی مرۆڤ توندوتیژە، سەبارەت بە دروشمەکەی کەسێکی دووڕووە، لە واقیعدا لە ئاژەڵ خراپترە.

ژیان فێری کردم

ئەگەر زانست خاوەنەکەی لە خراپەو تاوان دوورنەخاتەوە، ئەوا نەزانینی کەسێکی نەزان، لە زانستەکەی ئەو باشترە.

ژیان فێری کردم

زانست بریتی نییە لە زانینی شتێکی نادیارو نەزانراو، بەڵکو بریتییە لە سوودوەرگرتن لە زانست!

ژیان فێری کردم

ناحەق وەکو ڕێوییەکی فێڵباز وایە، حەق وەکو مەڕێکی دەستەمۆ وایە، ئەگەر کۆمەكو پشتیوانی خودا نەبوایە بۆ حەقو ڕاستی، ئەوا هەرگیز حەق بەسەر ناحەقدا سەرنەدەکەوت!

ژیان فێری کردم

نهێنی سەرکەوتن لە ژیاندا، بریتییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ناڕەحەتیو کۆسپو تەگەرەکان، بە وێنەی دامەزراوی باڵندەکان لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لە گێژەڵۆکەی بیاباندا!

ژیان فێری کردم

مرۆڤی ژیر لە هەموو شتێکدا دەسەڵاتی خودا دەبینێت، لە وردەکاریو ڕێكوپێکی دروستکراوەکاندا، لە جوانیو قەشەنگی سروشتدا، لە داهێنانی دروستکراوەکاندا، تەنانەت لە سزاو تۆڵەی ستەمکارانیشدا!

ژیان فێری کردم

ژیانی دنیا سەرەتاکەی گریانە، ناوەڕاستەکەی نەهامەتیو دەردەسەریو ناڕەحەتییە، کۆتاییەکەشی تیاچوونە، لە پاشاندا یان بۆ نازونیعمەتێکی هەمیشەیی، یان بۆ سزایەکی هەتاهەتایی.

ژیان فێری کردم

با هەموو ئاواتێکت ئەوە نەبێت دەوڵەمەند بیت، یان هەژار بیت، بەڕاستی ژیان لە نێوان دەوڵەمەندیو هەژاریدا، پلەوپایەو مەنزڵگای قەناعەتکارانە. (قەناعەت لە دەریا دەوڵەمەندترە)!

ژیان فێری کردم

ئەو صندوقەی پڕ لە گەوهەرو مروارییە، جێگەی بەردو چەوی تێدا نابێتەوە، ئەو دڵەش کە پڕ لە حیکمەتو داناییە، جێگەی شتی بچووکی تێدا نابێتەوە.

ژیان فێری کردم

منداڵو شێت نازانن خەموپەژارە چییە، لەگەڵ ئەوەشدا ژیرە گەورەکان، لەوان بەختەوەرترو شادمانترن.

ژیان فێری کردم

حەقو ناحەق پێکەوە گفتوگۆیان کرد:

ناحەق: من سەرم لە تۆ بڵندترە.

حەق: من پێیەکانم لە تۆ دامەزراوترە.

ناحەق: من لە تۆ بەهێزترم.

حەق: بەڵام من لە تۆ زیاتر دەمێنمەوە.

ناحەق: ئەوەی لەگەڵ مندایە، کەسانی بەهێزو خۆشگوزەرانو دەوڵەمەندن.

حەق: خودای گەورە دەفەرمووێت: (وكذلك جعلنا فى كل قرية أكابر مجرميها ليمكروا فيها وما يمكرون إلا بأنفسهم وما يشعرون)، واتە: (ئا بەو شێوەیە، لە ناو هەموو شارو شارۆچکەیەکدا گەورەترینی تاوانبارانمان باڵادەست کردووە، تا پیلانو تەڵەکە بگێڕن تیایدا، (بێئەوەی بزانن) کە: هیچ فێڵو تەڵەکەیەکیش ناکەن، بەزیانی خۆیان تەواو نەبێت، لە کاتێکدا هەست بەوە ناکەن، پیلان دژی خۆیان دەگێڕنو بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە (بەڵام) هەستی پێناکەن (چونکە غافڵو بێئاگان کە بەرەو لێواری مەرگ هەنگاو هەڵدەگرنو لە سزای پەروەردگار دەرباز نابن).

ناحەق: دەتوانم هەر ئێستا بتکوژمو لەناوت ببەم.

حەق: بەڵام نەوەکانم دەتکوژنەوە، ئەگەر دوای چەندساڵێکیش بێت.



# ڕەنگە ئەوە دوادیدار بێت...

بەهەشت محەممەد

لە منداڵییەوە پێکەوە هاوڕێ بووین، قۆناغەکانی خوێندنمان پێکەوە تەواوکرد، زۆرینەی کاتەکانمان پێکەوە بە سەربرد، وەکو دوو کۆتری شەیدا وابووین، بێ یەك هەڵمان نەدەکرد، ئەوەندە پێکەوەبووین، زۆرجار لێیان دەپرسین ئێوە خوشکن؟

ئێمەش ئەو پرسیارەمان زۆر پێخۆشبوو، لە وەڵامدا دەمانگوت: نەخێر، بەڵکو لە خوشك ئەزیزترو نزیکترین.

لە خولێکی فێربوونی زمان بەشداریمان کردبوو، وەکو هەر ڕۆژێکی تر ئەو ڕۆژەمان پێکەوە بەسەربرد، کە بەداخەوە من نەمدەزانی خەریکی بەڕێکردنی دواساتەکانی پێکەوە بوونمانین، نەمدەزانی ئەمە بۆ دواجارە چاوە ڕەشەکانی دەبینم، دوا جارە کە دەستمان لەناو دەستی یەکدا بێت،ماڵئاوایمان لەیەك کرد، دەمەو ئێوارە بوو، هەواڵیان پێدام کە (...)ی هاوڕێم لە کارەساتێکدا کۆچی دوایی کردووە، ساتێکی هێندە ناخۆشو بەئازار بوو کە هەرگیز ناتوانم وێنای بکەم، تەنها کەسێ لەو ئازارە تێدەگات کە ئەویش وەکو من کەسێکی ئەزیزی لە دەستدابێت، چۆن شتی وا دەبێت!! ئەمە چ کارەساتێکە ئەوی لێکردم؟ ئاخر من چۆن بەرگەی لە دەستدانی ئەزیزترینو نزیکترین هاوڕێی ژیانم دەگرم، دڵم سوکنایی نەهات، تا ئەوەی خۆم چوومە بەردەگای ماڵەکەیانو بە چاوی خۆم پەڕۆی ڕەشی پرسەکەیم بینی، پرسەی هاوڕێیەك کە دوێنێ پێکەوەبووین، بەڵام ئەمڕۆ ئیتر ئەو لەم ژیانەدا نییە. لەو ساتەدا بە دەم گریانو هەنسکی قوڵەوە پەڕەی دەفتەری یادەوەرییەکانمانم هەڵدەدایەوەو خۆزگەم بۆ ڕۆژانی پێکەوەبوونمان دەخواستو زیاتر لە هەموو کاتێك بیرم لە دوارۆژی پێکەوەبوونمان دەکردەوە، خۆزگە دەمزانی ئەوە دوادیدارمانە!

بەڵام من لە خۆمو لە هەمووان دەپرسم، ئەگەر بمزانیایە چی دەبوو؟ مەگەر هەمووان هەربەو جۆرە بەجێمان ناهێڵن؟! ئایا هیچ کام لە ئازیزانمان بەر لە کۆچی یەکجارەکی پێیان وتوین: ئەمە دوادیدارمان بوو، تا دونیایەکی تر ماڵئاوا؟!

بێگومان نەخێر لە پڕو بێ ئاگاداریو بێ پێشەکی، لە چاو ون دەبن، سەیرە تا ئەو کاتە هەست ناکەین کە چەند هۆگری ئەوانین، ژیان لەگەڵ ئەوان چ تامو چێژێکی هەبوو!

نەبوونی ئەوان چ بۆشاییەکی گەورە لە ژیانمان دروستدەکاتو چ خەمێك دەخاتە دڵمانەوە، لەو ساتەوە دەزانین کە چاومان چەندە بەپەرۆشە بۆ تەنها دیدارێك، چەند تامەزرۆی بیستنی دەنگی ئەوانین!

ئەگەر لە ماوەی ژیانیدا دڵی ئەوانمان ئازاردابێت، داخو حەسرەتەکە زۆر گرانتر دەبێت!

پرسیارێکی گرنگ: ئەگەر دیدارەکانی ئەمڕۆمان هەمووی، یان هەندێکی دوا دیدار بووبێت؟

چۆن ماڵئاواییت لە دایکت کرد؟ دەستیت ماچکرد؟ بەڕاست لە بیرت نەچوو بە هاوسەرەکەت بڵێی خوات لەگەڵ، بە ئومێدی خودا، پاش نیوەڕۆ دەتبینمەوە؟ منداڵەکەت ماچکردو بڵێی کە هاتمەوە دیارییەکی جوانت بۆ دەهێنم؟ ئەو ڕۆژەی هەواڵی کۆچی دوایی مامۆستاکەت پێگەیشت، ئەو مامۆستایەی بۆ یەکەمجار فێری پیتەکانی (دارا دوو داری دی) کردی، چەند مانگ، یان چەند ساڵ بوو بۆ سەردانی نەچوو بووی؟

دەترسم ڕۆژێ لە خەڵوەتگەی پیرانەوە پەیوەندیت پێوەبکەنو هەواڵی لێکنانی چاوی باوکتت پێ بڵێن، ئەو چاوانەی کە تا دوا لێکنان هەر چاوەڕێی هاتنی تۆیان کردووە!

با چێژ لە ئێستای پێکەوە بوونمان وەربگرین، نەکەی درێژە بدەی بە بێدەنگیت، لەگەڵ ئەو هاوڕێیەت کە دڵتان لێك زویر بووە، نەکا ئیتر دەرفەت نەبێت بۆ ئاشتبوونەوە، هەر ئێستا دڵی هەمووان لە خۆت ڕازی بکە، چونکە لەوانەیە ڕۆژێك دایکێك نەبێت بچیتە ئامێزیو دەستەکانی ماچ بکەی، وەکو ڕۆژان هاوسەرەکەت دەرگای ماڵو دڵی بۆت نەکاتەوە، وەك هەمیشە منداڵەکەت بە ڕاکردن بۆ لات نەیەتو نەڵێت بابە گیان هیچت بۆ کڕیوم؟

بەم کورتە پەخشانەی شاعیر کۆتایی دەهێنم:

که منداڵ بووم ویستم لە ڕۆژی دایکاندا، دیارییەکی ئێجگار قەشەنگ، بۆ دایکی ئازیزم بکڕم، بەڵام هێشتا پارەم نەبوو..

کاتێ لاو بووم، پارەم هەبوو، بەڵام ئەوەندە سەرقاڵبووم دەرفەت نەبوو، کاتێ چومە تەمەنەوە، ئەمجار ویستم، هەم پارەم هەبوو هەم دەرفەت

بەڵام ئەو کات دایکێك نەبوو هەتا دیاری لە بۆ بکڕم.



# دەستەکانی دایکت بشۆرە

ئالانی

یەکێك لە خوێندکارە سەرکەوتوەکان، کە سەرکەوتووانە قۆناغەکانی خوێندنی تەواو کردو بڕوانامەی زانکۆی بەدەستهێنا، ویستی پلەیەکی کارگێڕی لە کۆمپانیایەکی گەورەدا وەربگرێت..

لە پێش چاوپێکەوتنەکەدا، بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە لە ڕێگەی ژیاننامەی ئەم خوێندکارەوە بۆی دەرکەوت کە ئەم کەسە خوێندکارێکی سەرکەوتوو بووەو تەواوی قۆناغەکانی خوێندنی بەوپەڕی لێهاتووییەوە بڕیوەو تا ئەو ساتەی زانکۆی تەواو کردووە، هیچ ساڵێك نمرەکانی لاواز نەبووە..

لە ساتی چاوپێکەوتنذا، بەڕێوەبەر پرسیاری لە خوێندکارە لاوەکە کرد، ئایا لە ماوەی ساڵانی خوێندندا هیچ کات خۆت پارەی خوێندنەکەت داوە؟

لاوەکە وەڵامی دایەوە: هەرگیز..

بەڕێوەبەر پرسی: ئایا باوکت کرێی خوێندنەکەتی بۆ داویت؟

لاوەکە وەڵامی دایەوەو وتی: هێشتا تەمەنم تەنها یەك ساڵان بووە، باوکم کۆچی دوایی کردووە، تەنها دایکم تەواوی پارەو خەرجی خوێندنەکەمی داوە.

بەڕێوەبەر لێی پرسی: دایکت لە کوێ کار دەکات؟

لاوەکە وتی: دایکم جلی ماڵان دەشۆرێت!!

لەو کاتەدا بەڕێوەبەر داوای لە لاوەکە کرد، کە دەستەکانی نیشان بدات.. کاتێك سەیری دەستەکانی کرد، بینی دەستەکانی نەرمو ناسك بوو، بەوە نەدەچوو بۆ تەنها جارێك هاوکاری دایکی کردبێت..

بەڕێوەبەرەکە لێی پرسی: ئایا هیچ کات لە شۆردنی جلوبەرگدا هاوکاری دایکت کردووە؟

لاوەکە وتی: هەرگیز، دایکم هەمیشە داوای لێدەکردم کە سەرقاڵی خوێندنەکەم بم، چونکە دەیگوت من لەگەڵ جلشۆرین ڕاهاتووەو بەخێراییو لە کاتێکی کەمدا جلەکان دەشۆرم، تۆ کاتی خۆت بە جل شۆرینەوە بە فیڕۆ مەدە..

بەڕێوەبەرەکە پێی گوت: داواکارییەکی بچووکم هەیە، کاتێك گەڕایتەوە ماڵەوە، دەستەکانی دایکت بشۆ، پاشان سبەینێ وەرەوە بۆ تەواوکردنی چاوپێکەوتنەکە..

لاوەکە هەستیکرد کە هەلی وەرگرتنی کارەکەی نزیکە، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە داوای لە دایکی کرد ڕێگەی بدات دەستەکانی بشۆرێت، چونکە ئەوە بەستراوەتەوە بە دەستکەوتنی ئەو کارەی کە لە مێژە خەونی پێوە دەبینێت.

دایکی بەو هەواڵە زۆر دڵخۆشبوو، بەڵام سەرسام بوو لە داواکاری ئەو بەڕێوەبەرە، نەیدەزانی بۆچی ئەو بەڕێوەبەرە ئەو داوایەی لێکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەستەکانی دایە دەست کوڕەکەی تا داواکاری بەڕێوەبەرەکەی جێبەجێ بکات..

لاوەکە سەرەتا بە هێواشی دەستیکرد بە شۆرینی دەستەکانی دایکی، ئەوە یەکەمجار بوو، بە وردی سەیری دەستەکانی دایکی بکات، چەندە دەستەکانی چرچ بوون، دەستەکانی قڵیشاو زبر بووە، بەم دیمەنە هۆن هۆن ئەسرین بە چاوەکانیدا هاتنە خوارێ، ئەوە یەکەمجاربوو، کوڕەکەی ئەو دەستانە ببینێت، کە بە درێژایی ژیانی جلی شۆریوە، بۆئەوەی بتوانێت بژێوی ژیانیان دابین بکات!

هەموو ئەو زبرو قڵیشانەی لە دەستیدایە، ئەو نرخەیە کە داویەتی بۆ تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندنم، بۆ گەیشتنم بە داهاتوویەکی ڕووناکو پرشنگدار..

دوای ئەوەی لە شۆرینی دەستی دایکی بووەوە، لاوەکە هەستا هەموو ئەو جلوبەرگانەی شۆرد، کە بڕیار بوو ئەو شەوە دایکی بیشوات..

بۆ سبەینێ لاوەکە ڕۆیشتەوە بۆ لای بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە، لە کاتێکدا فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس مابوون..

بەڕێوەبەر لێی پرسی: دەکرێت هەواڵم پێ بدەیت کە چیت کردووەو دوێنێ لە ماڵەوە فێری چی بوویت؟

لاوەکە وەڵامی دایەوە: دەستەکانی دایکم شۆریو پاشان هەموو ئەو جلانەم شۆری کە لە ماڵەوە بوون..

بەڕێوەبەر پرسی: زۆر بە ڕاشکاوانەو بە ئەمانەتەوە پێمبڵێ، هەستت بە چی کردو فێری چی بوویت؟

لاوەکە وتی: یەکەم: زۆر بە باشی مانای بەخشینم بۆ دەرکەوت، ئەگەر دایکم ئەو هەموو قوربانیدانەی نەدایە، ئەوا هەرگیز نەمدەتوانی بەو ئاسانییە خوێندن تەواو بکەمو بڕوانامەی باڵا بەدەستبهێنم..

دووەم: هەستام بە ئەنجامدانی هەموو ئەو کارەی کە دایکم پێی هەڵدەستا، بەوەش زانیم کە ئەو لە پێناوی مندا چەند ماندوو بووە، چەندە دووچاری نارەحەتیو دەردەسەری بووە..

سێیەم: گەورەییو نرخو بەهای ئەو مرۆڤەم بۆ دەرکەوت، کە لە پێناوی ڕۆڵەکانیدا ئامادەیە هەموو قوربانییەك بدات..

لەو کاتەدا بەڕێوەبەر وتی: ئەوە ئەو بەڕێوەبەرەیە کە من بە شوێنیدا دەگەڕێم، تا ئەم کارەی پێببەخشم، دەمەوێت مرۆڤێك بێت قەدری هاوکاری کەسانی دی بزانێت، چونکە ئەو جۆرە کەسانە هەموو ئامانجیان ماڵو سامان نابێت..

ئێستا پیرۆزت بێت، تۆ بوویتە کارمەندێکی ئەم کۆمپانیایە..

دوای ئەو ڕۆژە، ئەم لاوە بە گورجو گۆڵیو چالاکییەکی نموونەییەوە، بە ڕێزگرتنو هاوکاری هەموو هاوکارانەوە کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد، سەرکەوتنێکی باشو ئاوازەی لە کارەکانیدا بە دەستهێناوە..

# هەر کەس بمبینێت هەرگیز ستەم لە کەس ناکات..



بەرزان ئەبوبەکر

ڕۆژێك بە نێو شەقامی سەرەکی شاردا پیاسەم دەکرد، پیاوێکم بینی دەستی لە شانییەوە بڕابووەوە، زۆر بە داماوی بانگی دەکرد، هەرکەسێك بمبینێت، هەرگیز ستەم لە هیچ کەس ناکات!

دیمەنەکەی زۆر کاریگەر بوو، منیش لێی نزیك بوومەوەو پێمگوت: برای بەڕێز، ئەوە چیتە، چیت بەسەر هاتووە، بۆچی بەمشێوەیە دەستت بڕاوەتەوە؟

وەڵامی دایەوەو وتی: براکەم چیرۆکی من چیرۆکێکی ڕاستەقینەی سەرسوڕهێنەرە، دانیشە تا بۆت بگێڕمەوە، منیش لە تەنیشتییەوە دانیشتمو بە تاسەوە گوێم بۆ ڕادێرا.. ڕۆژانێك بوو، من بەهێزو بە توانابووم، خاوەنی پلەو پایەو دەسەڵات بووم، لە دەستەو تاقمی ستەمکاران بووم، ڕۆژێك بە لوتبەرزیو لە خۆباییەوە بە ڕێگەدا دەڕۆیشتم، ڕاوچییەکم بینی، ماسییەکی گەورەی ڕاو کردبوو، زۆر پێی سەرسام بووم، ڕۆیشتم بۆ لایو پێمگوت: ئەو ماسییەم بدەرێ، وتی: ناتوانم ئەوە بە نرخەکەی قوت بۆ خێزانو منداڵەکانم دەکرم، منیش زۆر بێبەزەییانە لە ڕاوچییەکەم داو ماسییەکەم لێسەند.

ماسییەکەم هەڵگرتو بەرەو ماڵ گەڕامەوە، لەو کاتەدا دەستم کەوتە نێوان ددانی ماسییەکەوە، زۆر ئازارم پێگەیشت، ئەو شەوە تا سپێدە لە تاو ئازاری پەنجەم خەو نەچووە چاوەکانم، بەردەوام دەستم ڕادەژاند، بەڵام ئارامم نەبوو..

هەر کە ڕۆژ بووەوە بەپەلە ڕۆیشتم بۆ لای دکتور، سکاڵای ئازاری پەنجەم بۆ کرد، پزیشکەکە وتی: پەنجەت تووشی خۆرە بووە، ئەگەر نەیبڕیتەوە، سبەی ناچار دەبیت دەستت ببڕیتەوە، بە ناچاری ڕازیبووم پەنجەم بۆ ببڕنەوە، لەسەر ئەو ماسییە پەنجەیەکم دانا، ماوەیەکی پێچوو، ئازار دەستی پێکردەوە، بەڵام ئەمجارەیان ئازاری دەستم نەك پەنجەیەکم، زۆری ئازار نەیدەهێشت بۆ ساتێکیش خەو بچێتە چاوەکانم، دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ لای دکتور، ئەمجارەیان پێی وتم: ببورە دەبێت دەستت ببڕینەوە، ئەو کارەشیان ئەنجامدا..

ماوەیەکی تری پێچوو، باسکم کەوتە ئازار، بەڵام چ ئازارێك، ئازار نەیدەهێشت بۆ ساتێکیش چاوەکانم لێکنێم، لە هیچ شوێنێك ئارامم نەبوو، بەردەوام هاوارم دەکرد، هەموو ئەندامانی خێزانەکەشم هەراسان کردبوو، دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ لای دکتورو پێمگوت، کە دوای بڕینەوەی پەنجەو دەستم، باسکم ئازاری زۆری تێدا دروستبووە، بەشێوەیەك کە ناتوانم ئارام بگرم، دوای کۆمەڵێك پشکنین، ئەمجارەشیان دکتۆرەکە پێی ڕاگەیاندم کە بە داخەوە دەبێت لە ئەنیشکتەوە دەستت ببڕێتەوە، بەناچاری ڕازیبووم، بۆ ماوەیەك هەستم بە ئارامی کرد.. زۆر ڕاستە کە دەڵێن: لەشساغی تاجێکە بەسەری

لەشساغانەوەیە، تەنها نەخۆشەکان دەیبینن، ئێستا من دەزانم قەدری لەشساغیو نەبوونی ئازار چییە!

بەڵام بەداخەوە هێشتا کۆتایی نەهاتووە، دوای ماوەیەك دووبارە ئازار دەستی پێکردەوە، ئازارەکە چووە قۆڵم، کە زۆر لە ئازارەکانی پێشوو بەئازار تربوو، ئەمجارەشیان دکتۆرەکەم وتی: دەبێت قۆڵیشت ببڕینەوە، بمبورە بەڵام چارەیەکی ترمان نییە، ئەگەرنا ئازارەکە هەموو جەستەت دەگرێتەوە.

هەندێك لە دۆستانم پێیان وتم: هۆکاری ئەو ئازارە چییە؟ واتە سەرەتا لە چییەوە دروستبووە؟

منیش چیرۆکی ماسییەکەم بۆ گێڕانەوە..

پێیان وتم: ئەگەر هەر سەرەتا بە شوێن خاوەن ماسییەکەدا بگەڕایتایەو مافەکەیت بۆ بگێڕایەتەوەو داوای لێبوردنت لێ بکردایە، ئەوا تەنها ئەندامێکی جەستەت نەدەبڕایەوە!

ئێستاش تا درەنگتر نەبووە، بڕۆ بۆ لای خاوەن ماسییەکەو بە هەر نرخێك بێت بیدۆزەرەوە، داوای لێبوردنی لێ بکە، تا ئازار هەموو جەستەتی نەگرتۆتەوە!

ئیدی کەوتمە گەڕان بە دوای ڕاوچییەکەدا، زۆر گەڕام تا سەرەنجام دۆزیمەوە، کەوتم بەسەر پێیەکانیداو دەستەکانیم ماچکرد، دەستم بە گریان کردو پێم گوت: تکات لێدەکەم، لەبەر خودا لێم ببورە، تکا دەکەم.. گەردنم ئازاد بکە، داوابکە هەرچیت دەوێت تا پێت بدەم..

بەسەرسوڕمانەوە وتی: تۆ کێیت؟

من چ مافێکم بەسەر تۆوە هەیە، تا بەو شێوەیە داوای لێبوردن دەکەیت؟

وتم: من ئەو کەسەم کە بە زۆر ماسییەکەم لێسەندی، ئیدی چیرۆکی ژیانی خۆمم دوای ئەو ڕۆژە بۆ گێڕایەوە، سەیرێکی دەستی کردمو دەستی بە گریان کردو وتی: برای ئەزیزم، گەردنت ئازاد بێت، خۆزگە پێش ئەوەی درەنگ ببێتو بەم شێوەیەت بەسەربێت، بهاتیتایە بۆلام.

وتم: سوێندت ئەدەم بە خودا، ئەو کاتەی ماسییەکەم لێسەندی، دوعات لێکردم؟

وتی: بەڵێ، وتم: خودایە، ئەگەر ئەم کەسە هێزو دەسەڵاتی خۆی بەسەر لاوازی مندا سەپاندو بە ستەمو زۆرداری ئەو ڕۆزییەی کە تۆ بۆت ناردم، لێی زەوتکردم، خودایە تۆش دەسەڵاتی خۆتی نیشان بدەیت.

وتم: برای ئەزیزم، بینیت خودای گەورە چۆن هێزو دەسەڵاتی خۆی نیشاندام، لەسەر ئەو ستەمەی لە تۆم کرد، من پەشیمانی خۆم دەردەبڕمو بەڵێن دەدەم، هەرگیز ستەم لە مێروولەیەکیش نەکەم!!!

بەڵێ خوێنەرانی ئازیز، ئەوە نزاو پاڕانەوەی ئەو کەسەیە کە ستەمی لێدەکرێت، دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوەو نزاکانی هەرگیز ڕەتناکرێتەوە.

ڕەنگە هەمووان ئاواتەخوازبین، ستەمکارەکان بەمشێوەیە هەر لە دنیا تۆڵەیان لێوەربگیرێت، ستەملێکراو بە چاوی خۆی بیبینیایە، چۆن ستەمکار تۆڵەی ستەمەکەی بە چەندەها قات لێوەردەگیرێتەوە..

بێگومان هەموو ستەمکارێك تۆڵەی لێدەسەنرێتەوە، ئەمڕۆ بێت، یان سبەی!!



و: هیوا ئارام

# چا مەخۆرەوە..

## لە کاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەردا، چا مەخۆرەوە..

زانیارییەکی گرنگ، بۆ هەموو ئەو کەسانەی ڕۆژانە کۆمپیوتەر بەکاردەهێنن:

جارێکیان کچێکی تازە لاو، دوای مانەوەی لەسەر کۆمپیوتەرەکەی بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك، بە مەبەستی گەڕان بە دوای کۆمەڵێك وێنەو بابەتی گرنگدا بۆ توێژینەوەیەکی زانستی، بە دەست ئازاری چاوەکانییەوە دەناڵێنێت، بە هۆی زیادبوونی ئازارەکەیەوە، ڕۆیشت بۆ نەخۆشخانە، پزیشکی چاو پشکنینی بۆ ئەنجامدا، پاش پشکنین پێی ڕاگەیاند کە دووچاری وشکبوونەوەی گلێنەی چاو بووە، ئەویش بە هۆی دانیشتنی بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەردەم کۆمپیوتەردا، چاوەکانی دووچاری تیشکێکی بەهێزبووە، پزیشکەکە بە شتێکی زۆر نامۆ ئامۆژگاری کچەکەی کرد، کە هەموومان ڕۆژانە ئەنجامی دەدەین، بەڵام نەك بە مەبەستی چارەسەر، بەڵکو بە مەبەستی چێژوەرگرتن..

دەزانن ئامۆژگاری دکتۆرەکە چی بوو؟ کوپێك چا!!!

دکتۆرەکە پێی گوت: دانیشتنت لەبەردەم کۆمپیوتەر کەم بکەرەوە، بەڵام هەر کات کۆمپیوتەرت بەکارهێنا، کوپێك چا لەسەر مێزی کۆمپیوتەرەکەت لە نزیك شاشەکەیەوە دابنێ، باشتر وایە لەو لایەوە دایبنێیت کە ئامێری کۆمپیوتەرەکە (کەیسە)کەی لێیە..

لەبەرئەوەی کوپە چاکە ڕێژەیەکی زۆر لەو تیشکانە هەڵدەمژێت، کە لە کۆمپیوتەرەکەوە دەردەچێت..

کچەکە بە بیستنی ئەم ئامۆژگارییە زۆر سەری سوڕما، هەر بۆیە بە دکتۆرەکەی گوت: من کاتێك کۆمپیوتەر بەکاردەهێنم، هەمیشە کوپێك چا لە تەنیشتمەوە دادەنێم، بەڵام نەك بۆ ئەو مەبەستەی بەڕێزت پێت ڕاگەیاندم، بەڵکو بۆ خواردنەوە..

دکتۆرەکە وتی: ئەوە کارێکی زۆر هەڵەیە، چونکە تۆ چایەك دەخۆیتەوە، کە لێوان لێوە لە تیشکی کۆمپیوتەرەکەت..

کەواتە ئێستا بۆ ئەو گرفتە چارەسەر چییە؟ دکتۆرەکە وتی: دانانی کوپێك چا کارێکی زۆر پێویستە، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆر لە تیشکی کۆمپیوتەرەکەت هەڵمژێت..

تۆی بەڕێزیش دەتوانیت تاقی بکەیتەوە، سەرنج بدەو بزانە، چۆن کوپە چاکەت ڕەنگی دەگۆڕێتو تامی ناخۆش دەبێت..

ئیدی هەمیشە کوپێك چا لەسەر مێزی کۆمپیوتەرەکە دابنێ، بەڵام بۆ خواردنەوە نا، بەڵکو بۆ هەڵمژینی تیشکە زیانبەخشەکانی کۆمپیوتەرەکەت!

# پەتی یارییەکان بە دەستی کێیە؟

سپێدە هۆرمزیار



تەواوی مرۆڤەکان لە بەرامبەر ناڕاستی گوتن، نارەحەتی دەچێژن، کەچی یان خۆیان بەداوی تەڵەی درۆی بەرامبەرەکانیان دەبنەوە، یان ئەوەی کە خۆیان خوڵقێنەری ئەم داوەن بۆ ئەوانی تر، هەمیشە ئەو مەودایەی کە بۆ هاوارو ناڵەکردن لە تاو کڵپەی گەرمی ئاگری درۆکردنەوە تەرخانکراوە. بۆ ئەبەد بەشێك لە تاکەکان پانتاییەکیان نەبەخشیوە بەهزریان، دەربارەی چۆنیەتی خامۆشبوونی ئەم بڵێسەی ئاگری درۆکردنە، بەرێڕەوێکی سادەتر عەرزتانی بکەم.

زۆرێك لە ئێمە لەبەر سیمای ڤێزەونی درۆکردن، تەرکیز ناخەنە سەر تابلۆی درۆکردنو تێڕامان بکەن لەسەر چۆنیەتی بەرپابوونی ڕەگەزەکانی ناڕاستی گوتن، تا بەهۆیەوە لە دواجاردا بەربەستەکانی چارەسەرکردن لە ژێرپێتاندا ڕێخۆشکەری بنوێنێ، بەرێژەیەکی زۆر گوێبیست بوون لە قسەی ساختەو کردنی لە ژیانتاندا ماڵئاوای بخوازێ، کارێکی سادە ئامێزە ئێوە ڕێگری بکەن لە خودی خۆتان کە دڕندەی هیچ ترسێك، یان بەرژەوەندییەکی تایبەتی ناچاری نەکات بۆ ماڵی درۆ سازاندن هەنگاوبنێ، بەڵام هیچ هیوایەك وجودی هەیە کە کارێك بە ئەنجام بگەیەنن، ئەوانی تر سەرقاڵی درۆکانی خۆیانتان نەکەن؟ بۆ نا هەیە، چوون ئاخر هەندێ کات خۆتان بە بەرامبەرەکانتان دەڵێن درۆمان لەگەڵ بکەن!؟

چونکە ئێمە درۆیەکی شیرینمان لا ئاسودەبەخشترە لە ڕاستییەکی تاڵ، کە پێچەوانە ڕاستەکەی ئەوەیە، ڕاستییەکی تاڵ، هەزار درۆی شیرین دێنێ.

بە تەرزێکی تر گەرەکمە بڵێم: خۆتان هۆکارگەلی بنەڕەتین کە زەمینە دەسازێنن، ئەوانی تر قسەی ناڕاستی لە بەرامبەری ئێوە بدرکێنن! دەپرسن چۆن؟ وەڵامەکەی ئەوەیە، بۆ نمونە هەندێجار خۆش گازندەی دەکەن، بێ دڵی خۆتان ناکەن لە فراوانکردنی ڕێژەی ئەو گلەییەی لە دەوروبەرەکەتانی دەکەن، کاتێکیش ئازیزەکانتان ئیتر قەڵسو بێزار دەبن لە چەشتنی ئەم هەمووو ژەهری گلەییانەی ئێوە، هەوڵدەدەن ببن بە یەکێك لە پەنابەرانی وڵاتی درۆسازاندن. لە پاڵ ئەو درۆکردنەش، ئەوان مەیلی ئەوەیان هەیە کە دەمی ئێوەی گلەیی کارەکان لە ئاستی خۆیان دەمکوت بکەن، لە ئاگادارتان مەزەندەی ڕەزایەتیتان ببینن، نەوەك ئەوەی ڕاستییەکەی بڵێنو توڕەیتان ببینن. بۆیە هەرگیز لە یادی مەکەن، خۆتان پەتی یارییەکان دەگرنە دەستو ڕێخۆشکەری دەکەن، کە بەرامبەرەکانتان چۆن چۆنی مامەڵەتان لەگەڵدا بکەن؟

# سێوەکەی ئادەم

پەیام خەتاب

سوهراب بە شڵەژاویو پەشۆکاوییەوە ڕووی کردە حەوشەکەو بیری لە سەرجەم ئەو شتانە دەکردەوە، کە بۆی بوونەتە پرسیارو وەڵامی دەستناکەوێت، لە پڕ یەکێ بانگی کرد:

- هێی تۆ، بۆ کوێ دەچی؟

- سوهراب سەری بەرزکردەوەو چاوێکی بە چواردەوری خۆیدا گێڕاو کەس دیار نەبوو!

- لەگەڵ تۆمە ئەوەتا لێرەم.

- کە ئاوڕی دایەوە پیرەپیاوێکی بینی کە سەبەتەیەك سێوی بەسەرشانەوەبوو، سەبەتەکەی هێنایە خوارەوەو سێوێکی بۆ سوهراب هاویشت، دەزانی بۆ مرۆڤ خرایە سەر زەوی؟

- سوهرابیش بە هۆی ناڕەحەتی دەروونیو پەشۆکاوییەکەی خۆیەوە، توانای وەڵامدانەوەی پیرە پیاوی نەبوو، پیرە پیاویش پرسیارەکەی دووبارەکردەوە..

- سوهراب ئەمجارەیان بە توڕەییەوە: ببورە توانای گەڕانم بە دوای وەڵامەکان نەماوە.

- پیرە پیاو: گەڕانی ناوێ وەڵامەکە لە نێو دەستتدایە!

- سوهراب سەیرێکی دەستیکرد: لەبەر سێو، چییە تۆش بەم تەمەنەتەوە خۆشبەزم دیاریت!!!

- پیرە پیاو: خۆشبەزم کەسێکە وەڵامی لە نێو دەستدایە، بەڵام بەدوایدا دەگەڕێت!

- سێوەکەی لە دەستگرتو بەرەو ڕووی سوهراب ڕۆیشت: مرۆڤ بە سێوێ تاقیکرایەوەو زەوی پێبەخشرا، تاپڕی بکات لە دارسێوو هەمیشە بە بەرچاویەوە بێت، لە پێناوی چی، چی لە دەستدایە، چی بە دەستهێنا؟ بەڵام تاقیکردنەوەی ئەمجارەیان پاداشتی جیاوازترە، هەستت بەوەنەکرد کە لە نێو دەستتدایە، بۆیە هەمیشە بڕیاری گەڕان دەدەیت، لە کاتێکدا ئەو شتەی تۆ لە شوێنی تر بۆی دەگەڕێیت، لە نێو دەستی خۆتدایە!!! زۆرجار بڕیاردەدەیت کە لەوپەڕی دونیا وەڵامت دەستبکەوێت، بەڵام تۆزێك وەستانو هەستکردنی جوانترین وەڵامت دەداتێو باشترین ڕێگات بۆ دەدۆزێتەوە، لەوەتەی هەم سێو لە دارسێوەکان دەگەمەوەو مرەبای لێ دروستدەکەم، جارێکی تر خزمەتی دارسێوەکان دەکەم، تا بەری داهاتوو بدات، هەروەك یاسای ژیان، تۆ هەموو ڕۆژێ مرەبای دەستەکانی من دەخۆی، بەڵام پێی نازانی، وریابە ڕەنگە بە سێوێ تاقیبکرێیتەوە..

- سوهراب سێوەکەی هەڵدایەوە ناو سەبەتەکە: پێویستیم بە سێو نییە، ئامادەی تاقیکردنەوەیەکی تریش نیم، ئەگەر تامی مرەباکەی تۆشم کردبێت، پەشیمانم ئیتر تامی ناکەم، سێوێکت پێدامو پێویستیش ناکات ببی بە چرا بۆم!!! ئەوا بۆتم گەڕاندەوە ئیتر چی؟

- پیرە پیاو وەڵامیدایەوە: کە دەستەکانت بۆ سێوەکە کردەوە هەڵبژاردنی خۆت بوو، کە وەرتگرت، کە بۆشت گەڕاندمەوە، پەشیمان بووی لەوەی کە وەرتگرت، ئەم سێوە دەناسمەوە، گەر بیخەیتە ناو هەزار سێو، چونکە تەنیا بۆنی دەستەکانی منو تۆی لێدێت! وریابە ڕێگای گەڕانەوە وەك ڕاکردن ئاسان نییە!!

- سوهراب وتی: ببورە لە قسەکانت تێنەگەیشتم!

- پیرە پیاو: نا ڕۆڵە تێگەیشتووی، بەڵام ناتەوێ پێیبگەی، قەدری دارسێوەکان بگرە، چونکە دارسێوەکان هەمیشە فێرمان دەکەنو تاقیمان دەکەنەوە، با ڕۆژێ نەیەت بێ دارسێوو مرەباو سێبەر بین.



گوڵان حەمەئەمین



# شەرم، هۆکارو چارەسەر

لە ژمارەی پێشوودا پێناسەیەکی کورتی شەرممان بە هەردو جۆرەکەیەوە (شەرمی باشو خراپ)، کرد، لەگەڵ هەموو ئەو نیشانانەی کە دووچاری کەسی شەرمن دەبێتەوە، وەك (سووربوونەوەی دەمو چاوو گوێچکەکان، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیو عەرەقکردنەوە، لێدانی خێرایی دڵو وشکبوونەوەی قوڕگو لەرزینی دەستو قاچ..)، پاشان باسمان لە شەرمکردن لای منداڵو هۆکارو چارەسەری کرد، بە پشتیوانی خودا لەم ژمارەیەدا باس لە شێوازو هۆکارەکانی شەرمکردن دەکەین، لای گەورەکان...

**شێوازەکانی شەرمکردن:**

١- شەرم لە تێکەڵاوبوون: کەسی شەرمن خۆی بە دوور دەگرێت لە کۆڕو دانیشتنی هاوڕێکانی، هەمیشە خۆی لە قسەکردن دەپارێزێت، زیاتر حەزدەکات تێکەڵاوی ئەو کەسانە بکات، کە وەکو خۆی شەرمنو حەز بە تێکەڵاوی کەسانی ئاسایی ناکات.

٢- شەرم لە قسەکردن: کەسی شەرمن هەمیشە بێدەنگی هەڵدەبژێرێت، ئەگەر پرسیارێکیشی لێبکرێت، زۆر بە کورتی وەڵام دەداتەوە، یان هەندێجار وەڵام ناداتەوە، یان نازانێت وەڵام بداتەوە، کاتێکیش کە قسەی بۆ دەکەیت، سەیرت ناکات، ئەمجۆرە کەسە دەترسێت لەوەی کە ئەگەر بە قسەیەك بەشداری بکات، گاڵتە بە قسەکەی بکرێت، یاخود وا هەستدەکات کە ئەو پرسیارەی ئەو لە مێشکیدا گەڵاڵە بووە شیاوی باسکردن نییە، هەربۆیە ڕێگە بە خۆی نادات کە پرسیارەکەی ئاڕاستەی هاوڕێکانی بکات.

٣- شەرمکردنی کۆمەڵایەتی: دوورکەوتنەوە لە بەشدارینەکردن لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکانو گەشتکردنو چالاکی وەرزشی، هەروەها خۆبەدوورگرتن لە قسەکردن بۆ کۆمەڵ، یان بۆ میدیاو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.

٤- شەرمکردن لە ڕواڵەت: ئەمجۆرە کەسە شەرم دەکات لە پۆشینی جلوبەرگی نوێ، یان لە جلوبەرگی مەلەکردن، یان نانخواردن لە چێشتخانەکان، تەنانەت ڕووی نایەت یاریش بکات، بە بیانووی ئەوەی نەبادا نەتوانێت وەکو هاوڕێکانی باش یاری بکات.

٥- شەرمکردن لە ئامادەبوونی لە بۆنەو ئاهەنگو یادەکاندا: ئەمجۆرە کەسە وا هەستدەکات تەواوی خەڵکی ئەو بۆنەیە، سەیری ئەم دەکەنو تەرکیزیان لەسەر ئەو دەبێت.

٦- شەرمکردن لە تێکەڵاوبوونو مامەڵەکردنی گەورەکان: وەکو مامۆستایانو بەڕێوەبەرو سەرپەرشیارانو... هتد.

٧- خودپەسەندیو هەستیاری لە ڕادەبەدەر..

**هۆکارەکانی شەرمکردن:**

١- متمانە بەخۆنەبوون: واتە کەسی شەرمن متمانەی بە خۆیو تواناکانی نییە، بە مانایەکی تر لە خۆی ڕازی نییە، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکییە بۆ شەرمکردن.

٢- هۆکاری بۆماوەیی: ڕەنگە زۆرجار شەرم هۆکارەکەی بۆماوەیی بێتو کەسەکە لە باوانییەوە بۆی مابێتەوە، هەروەکو تەواوی سیفاتە بۆ ماوەییەکانی دیکە.

٣- هۆکاری ژینگەیی: زۆرجار ئەو ژینگەیەی مرۆڤ تێیدا گەورە دەبێت، دەبێتە هۆکاری دروستبوونی شەرم تیایدا.

٤- هەست بە کەمیکردن: زۆرجار کەمئەندام، یان قەڵەوی لە ڕادەبەدەر، یاخود کورتی باڵا، یان کەموکورتی لە هەستەوەرەکاندا وەکو: (لاوازی بیستن، یان بینین، یان پسکی، یان نەخۆشییەکانی پێست).. دەبێتە هۆی دروستبوونی شەرم..

٥- هۆکاری ماددیی: زۆرجار نەبوونی توانای ماددی دەبێتە هۆی دروستبوونی شەرم، کەسەکە وا هەستدەکات کە ئەو جلوبەرگەی لەبەریدایە شیاو نییە، یان مۆدێرن نییە، یان وا هەستدەکات کە بە هۆی نەبوونی بڕی پارەیەکی گونجاو لە باخەڵیدا دووچاری هەڵوێستی ڕووگیر ببێتەوە..

٦- شێوازی پەروەردە: حاڵەتەکان زۆرن، ڕەنگە هەندێجار هۆکاریی شەرم جۆری پەروەردەی خێزان بێت، بۆ نموونە کوڕێکی تاقانەیەو چەند خوشکێکی هەیە، لە ڕادەبەدەر لە لایەن ئەندامانی خێزانەوە گرنگیو نازی پێدەدرێ، وا هەستدەکەن کە لە دەریشەوە هەمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، هەروەها زۆرجار بە پێچەوانەوە خێزان لە ڕادەبەدەر منداڵ دەشکێنێتەوەو مامەڵەیەکی توندوتیژو دڵڕەقانەی لەگەڵدا دەکەن، زۆر سەرزەنشتی دەکەن، زیاد لە پێویست لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە دوارۆژدا متمانەی بە خۆی نەمێنێتو هەست بە کەمی بکات.

٧- دواکەوتن لە خوێندن: دواکەوتن لە خوێندن، دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە واهەست بکات کە تواناو لێهاتوویی و شارەزایی لە هاوڕێکانی کەمترە..

بە ویستی خودا، لە ژمارەی داهاتوودا باس لە چارەسەری شەرمکردن دەکەین.

ئاسۆ حاجی



# شوێنی یادگارییەکانی جێهێشت بەڵام یادگارییەکان نا!

هەر لەو ساتەی چاوی هەڵهێناوە لەم گەڕەکەبووە، قۆناغەکانی خوێندنیشی هەر لەو گەڕەکەبوو، ئەو ڕۆژەی مامۆستا لە کۆڵانی گەڕەکەکان دەگەڕان، لە دەرگای هەموو ماڵێکیان دەدا، بۆناونووسکردنی منداڵان بۆ قوتابخانە، سیروان خۆی لەسەربان شاردەوە، چونکە گوێی لە هەندێك کەس ببوو دەیانگوت: قوتابخانە زۆرناخۆشە، ئەویش وتی: خۆم دەشارمەوە تا نەمبینن، وایدەزانی ئەگەر نەیبینن ناونووس ناکرێت، بەڵام دایکی پێناسەکەی هێناو دایە دەست مامۆستاکەو ناویان نووسی.

سیروان هەر لەو کاتەی ببوو بە قوتابی، ڕۆژ بە ڕۆژ قوتابخانەی لا خۆشتر دەبوو، هاوڕێی زۆری پەیداکرد، بەیانیان دەهاتن لە دەرگایان دەدا، زۆرجاریش دەهاتنە ژووری تا خۆی ئامادە دەکرد، بەتایبەتی بەیانیانی ڕۆژانی زستان، کە زۆر باراناویو ساردبوو، کاتێك بەڕێدەکەوتن بەدەم ڕێگاوە قسەی خۆشیان دەکرد، بە پرسیارکردن دەربارەی خواردن چ جۆرێکت پێخۆشە؟ یان جۆرەکانی گوڵی بەهار کامانەن؟ یان ئەگەر زستان بوو، بارانێکی زۆریش ببارێت، بۆ نانی نیوەڕۆ چ خواردنێك خۆشە؟ یان میوەکانی هاوینی چییە؟ تا دەگەیشتنە قوتابخانە لە گەڕانەوەش هەروابوو، یان باسی مامۆستاکانیان دەکرد، یان وانەکانیان.

هەموویان خەڵکی یەك گەڕەك بوونو دراوسێی یەکتربوون، هاوینانیش بۆ یاریکردن هەر لەگەڵ یەکبوون، تا سەرەتایی تەواوکرد، زۆر هاوڕێی خۆشەویستی پەیداکرد، لە قۆناغی ناوەندیو ئامادەیش ڕۆژ بە ڕۆژ هاوڕێکانی زیاددەبوون، هەندێکیان لەگەڵ یەك دەمانو هەندێکیان بەهۆی دەرنەچوونیان بەجێدەمان، کەچی هاتووچۆو چوونو هاتنی قوتابخانەیان هەر بە یەکەوە بوو، بەڵام بەهۆی هەژارییانەوە باوکی سیروان کرێکاری دەکرد، ئەو پارەیەش کە دەهاتە دەستیان کەمبوو، خانووشیان نەبوو، کرێچی بوون، شەوانە دایکی سێ چوار خانووی بۆ دەژماردو دەیگوت: پێنج ساڵ لە خانووی سەری کۆڵان بووینو سێ ساڵ لەمبەری شەقامی سەرەکیو دووساڵ لەملا ...هتد، ئێستاکەش لەم خانووەین.

هاوتەمەنەکانی گەڕەکی خۆیانی هەموودەناسی، تەنانەت بە تەمەنو بە ساڵاچووەکانیش، دوکاندارەکانیش هەندێکیان بە هۆی قوتابخانەو هەندێك یاری تۆپێنو هەندێك بە هۆی چوونە مزگەوتەوە، هەریەکە بە جۆرێك.. ناخۆشترین کاتی سیروان ئەو شەوەبوو کە خاوەن خانووەکە هاتو وتی: دەبێت خانووەکەم بۆچۆڵ بکەن، چونکە کوڕەکەم دێتە ناوی، باوکی سیروانیش زۆرپاڕایەوەو وتی: منداڵەکانم وردنو لە قوتابخانەن، زۆر شتی تریشی وت، بەڵام خاوەن خانووەکە وتی: ئەوانە نازانم تاسەری مانگ چۆڵی بکە، ئەوەندەی وتوو ڕۆیشت، لە دوای ئەو شەوە باوکی زۆر گەڕا بۆ خانوو، تاکو هەر لە گەڕەکەکەی خۆیان پەیدای بکات، بەڵام یان زۆر گرانبوو، یان تەنها بۆ فرۆشتن بوو، دوای ماندووبونێکی زۆر، لە دەرەوەی شار بە نزیکەی پانزە کیلۆمەتر خانوویەکی گڵیان دەستکەوت، کە هی دۆستێکی دێرینی باوکی بوو، پێی وتن هەتا خۆتان دەتانەوێت لەوێبن، وایدانێن خانووی خۆتانە.

چەند مانگ تێپەڕی، ڕۆژ بەڕۆژ تادەهات خویان بەناوچەکە دەگرت، بەڵام سیروان هەمووشەوێ، کە دەچووە سەرجێگاکەی، سەری دەخستە سەرسەرینو هەموو ژیانی ڕابردووی دەهاتەوە پێش چاو، یادگارییەکان، هاوڕێکان، کۆڵانەکان، دراوسێکان. دەیگوت: بۆچی ئێمەت وا ئاوارەکردو بێبەشی هەموویادگارییەکانت کردین، پیاسەی ئێواران، نوێژە جەماعەتەکانی مزگەوت، بەتایبەتی نوێژی ئێوارە کە دەهاتمە دەرێ لە مزگەوت خۆشترین کاتم بوو، دانیشتنی عەسران لەگەڵ هاوڕێکان، سەردانی شەوانی هاوڕێکان. دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی گەرم سەرینەکەی تەڕدەکرد، بەدەم هەنسکەوە خەوی لێدەکەوت، هەموو شەوێ ئەمە حاڵی بوو.

خاوەن خانووەکەش، خانووەکەی تێکدابوو، ژێرەوەی کردبووە دوو دووکانو سەرەوەشی کردبووە دوکانی پەردە، کەچی دەیگوت بۆ کوڕەکەمە!

سیروان زوو زوو دەچوو بۆ گەڕەکە کۆنەکە، بۆ هەڵمژینی بۆنی هەوای گەڕەکەکەیان، بۆ بینینی شوێنی یاری منداڵیو ڕێگای قوتابخانەو ئەو فڕنی صەمونەی کە ئێواران صەمونی لێدەکڕی، یان شەوان دەچووە دوکانی ساردەمەنییەکە کە هەموو جارێ کاستەری لێدەکڕی، بۆ ماڵەوەشی دەبردەوە لەگەڵ خۆی، کە خۆشترین کاستەری هەبوو.

ئێستاش هەموو شەوێ سەیری ئەم فلیمە دەکات، یا لە خەیاڵ، یا لە خەونا لەبێ خانوویيا هیچ کات ماڵیان ڕێکنەدەبوو، چونکە بەردەوام لە بارکردندابوون، لەم خانوو بۆ ئەو خانووە، لە کۆتاییدا هەموو شوێنی یادگارییەکانی جێهێشت، بە هۆی کرێچێتیو بێ خانوویی، بەڵام یادگارییەکان شوێنەکانی جێنەهێشت، کە هەستو ناخی دڵبوون.



# نامە نورینەکان

## نامەی پێنجەم

دەمێك بوو تاسەی دیداری نامە نورینەکانی بووم، لە ناخەوە بیری وتە جوانەکانیم دەکرد، کە هەمیشە بە بۆنی گوڵاوی وشەکانی مەستم دەکەنو بە بیستنی دێڕ بە دێڕی نامەکانی نوقمی شادمانی دەبمو ئاوێزانی هەستی پاکو دڵی پڕ میهری مامۆستاکەم دەبم، دوور لە وتەکانی ئەو هەمیشە خۆم لە دنیای غەریبیدا دەبینم، هەمیشە زایەڵەی دەنگە هێمنو لەسەرخۆکەی لە ناخمدا دەزرنگێتەوە، وشەکانی وەکو باوەشێکی نەرم، ئارامی بە دڵە پڕ لە خورپەکەم دەبەخشن، لە نێو وتەکانیدا وەکو شانەی هەنگوین، دڵۆپ دڵۆپ هەنگوینی وشەی پاكو بێگەردی دەڕژێنە گەرووی تاڵم، بە گەیشتنی نامەکانی پەپوولەی خەندە وەکو تەرزە بەسەر لێومدا دەبارێن، بەختەوەرییەك دەبێتە میوانم کە هەموو کونجو کەلەبەری لاشەم داگیر دەکات، ئەو بە وتە نەرمو ناسکەکانی ڕۆحی شەکەتو ماندووم دەدوێنێ، ئای ئەو مرۆڤانە چەند سەیرن، دەگرین تا ئێمە پێبکەنین، دەسوتێن تا نورمان پێببەخشن!

دەمرن تا ئێمە بژین، بێدارن تا ئێمە بە ئارامی بنووین!

لە تاریکترین شەودا چران!! لە ساردترین شەوە زەنگی زستانا، گەرمیو سۆزو میهرەبانین! هیوای ساتە دژوارەکانن، بۆ ئەم زەمانە سەختە، هاوڕێی ڕۆحن، دڵی سپی لەم ڕۆژگارە ڕەشەدا هەموو زێڕو زیوی دنیا دێنێت!

هەموو پەیامێکی نوێی، چەپکێ نوری زیوینەو ڕێگام بۆ ڕۆشن دەکاتەوە!

درەنگانێکی شەوبوو، وەکو هەموو شەوێ دەستم خستبووە ژێر چەناگەمو یادی ئەو ڕۆژانەم دەکردەوە، کە چ ساتێکی خۆشبوون، لە ناخەوە گوێم بۆ مامۆستاکەم شلکردبوو، دەیگوت: ڕۆڵەکانم: دونیا شەرابی شەیتانە، ئەوەی مەستی ئەو شەرابە بێت، لە ئوردوگای مردووواندا بە پەشیمانیو خەسارەتمەندی بەخەبەردێت!

دەیگوت: ئازیزانم ئامۆژگارییەکەی حەسەنی بەسریتان لە بیرنەچێت، کە هەمیشە دەیگوت: (ئەگەر بینیتان خەڵکی لە مەیدانی دنیادا کێبەرکێتان لەگەڵ دەکەن، ئێوە لە مەیدانی ڕۆژی دواییدا کێبەرکێیان لەگەڵدا بکەن)!

لە ناکاو لە زەنگی دەرگا درا، دڵانی شەیداو ئەویندارانی ڕاستەقینە، هەمیشە لە دوورێ ڕا، بۆنو بەرامی مەحەببەتی خودایی دەکەنو هاوار دەکەن (إنی لاجد ریح یوسف).

نامەی مامۆستاکەم بوو، وەکو گەورەترین دیاری

وەرمگرتو خستمە سەرچاوەکانمو تێر بۆنم کرد!

(عەزیزی من)، لە دڵدا پەرتەوازەییەك هەیە، تەنها رووکردنە خودا چاری دەکات!

تەنیاییەك هەیە، تەنها هۆگربوون بە خودا لە خەڵوەتی موناجاتا چارەسەرێتی!

خەمێك لە دڵدا هەس، تەنها شادمانی بە ناسینی زاتی خوداو راستگۆیی لە مامەڵەکردنیدا لای دەبا!

نیگەرانییەك لە دڵدایە، تەنها بە راکردن بەرەو لای خودا ئارام دەبێت!

گڕی حەسرەتێك لە دڵدایە، بە رازیبوون بە فەرمانو قەزاو قەدەری ئەوو ئارامگرتن نەبێت، تا قیامەت ناکوژێتەوە!

دڵان هەمیشە داوا دەکەن، سواڵکەری مەتاعی دنیان، وازناهێنن تا ئەو کاتەی خودا دەبێتە تەنها داواکراویان، ئەوسا ئیدی بۆلای شتێکی دی ئاوڕنادەنەوە!

دڵانی هەژارن! چاری ئەو هەژارییەیان تەنها خۆشەویستی خوداو یادی بەردەوامی ئەوو ئیخلاسی بەندایەتییە، خۆئەگەر هەموو دنیا ببەخشی بە مرۆڤ، ناتوانێت ئەو هەژارییە چارەسەر بکات، بۆیە مرۆڤەکان بێ خۆشەویستی خودا، لە لوتکەی هەژاریدان، با هەموو دنیایان لە ژێر دەستدا بێت!

دڵەکان نەخۆشن، شیفای دەردی بیمارییان تەنها دیداری خودای گەورەیانە، لە ڕۆژی (مەزیدا) ئەو رۆژەی کە بە بینینی رووخساری پەروەردگاریان دەگەنە چڵەپۆپەی سەرفرازیو شادمانی!

لە بەشی دووەمی نامەکەیدا بۆی نووسیبووم (وریای شیرینییەکەی بە)!

دەگێڕنەوە کابرایەك بە نێو دارستانە چڕو دڵگیرەکانی ئەفریقادا دەسوڕایەوە، لە دیمەنی دڵڕفێنی دارە بەرزەکانو سەوزایی دارستانو گوڵوگوڵزاری ڕەنگاو ڕەنگو جریوەو چریکەی چۆلەکەو بولبول سەرسام مابوو، لەو کاتەدا کە مەستی بۆنی خۆشی دارستانو دیمەنە ڕەنگاو ڕەنگەکانی بوو، لە ناکاو گوێی لە نەڕەی دوژمنێك بوو، کەتا دەهات دەنگەکە نزیکترو گەورەتر دەبووەوە!

کاتێك کابرا ئاوڕی دایەوە، بینی ئەوا شێرێك لە برسا نێو قەدی باریکبووە، بە خێراییەکی خەیاڵی بەرەو لای ئەم ڕادەکات، کابرا تا بڕستی تێدابوو، دەستی بە ڕاکردن کردو شێرەش بەدووی دا!

وەختێك کابرا بینی شێرەکە نزیك دەبێتەوە، بیرێکی کۆنی بینی، لە ترسی شێرەکە خۆی فڕێدایە نێو بیرەکەو بە گوریسەکەی کە ئاویان پێدەردەهێنا خۆی گرتەوە!

بە هەڵواسراوی لەمبەر بۆ ئەوبەری بیرەکە جۆلانەی دەکرد، هێشتا بە تەواوی هەناسەی ڕزگاربوونی هەڵنەکێشابوو، شێرەکە زۆر نەبوو بێدەنگ ببوو!

تەماشا دەکات لە خوارەوەی بیرەکەدا مارێکی گەورە دەفیشکێنێت، هاوکات کە بیری لە ڕێگایەك دەکردەوە، بۆ ڕزگاربوون لە شێرو مارەکە، دەبینێ وامشکێکی ڕەشو مشکێکی سپی، خەریکن گوریسەکە دەکرۆژنو دەیانەوێت بیپچڕێنن!

کابرا لە تاوا خەریکبوو شێت دەبوو، بە پەلە کەوتە جوڵاندنی گوریسەکە تا مشکەکان دوورکەونەوە!

بە توندی لەمبەر بۆ ئەوبەری بیرەکە جۆلانەی دەکردو خۆی بە دیواری بیرەکەدا دەدا، لەناکاو خۆی بە شتێکی نەرمو لینجدا کێشاو وەختێك ئانیشکی لێدا، سەیری کرد هەنگوینە، کابرا دەستی بە خواردنی هەنگوینەکە کردو پەیتا پەیتا بە پەنجەکانی هەنگوینەکەی دەلێسایەوە، بە شێوەیەك کە لەبەر شیرینی هەنگوینەکە بارودۆخەکەی لە یاد نەما، لە ناکاو بەخەبەرهات، چونکە ئەو لە خەوێکی ناخۆشدا بوو!

ئازیزم: کابرا بڕیاری دا، بچێتە لای کەسێکی شارەزا، تا خەوەکەی بۆ ڕاڤە بکات..

چووە لای زانایەكو خەوەکەی بۆ گێڕایەوە!

ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە لێی پرسی: ڕاڤەی خەوەکە نازانیت؟!

کابرا گوتی: نا!

زاناش دەستی بە ڕاڤەکردنی خەوەکەی کردو گوتی: ئەو شێرەی بە دووتا ڕای دەکرد، ئەوە فریشتەی ڕۆح کێشانە!

ئەو بیرەی کە مارەکەی تێدابوو گۆڕەکەتە!

ئەو گوریسەی خۆت پێوەهەڵواسیبوو، تەمەنەکەتە!

مشکە ڕەشو سپییەکە شەوو ڕۆژن، کە بەردەوام لە تەمەنت دەخۆن.

- قوربان ئەی هەنگوینەکە؟!

-ئەوە ئەم دنیایەیە کە تامە شیرینەکەی مردنو ڕۆژی قیامەتی لە بیر بردوویتەوە!

کەواتە با شیرینی دنیای فانی، کۆچو قیامەتمان لە یاد نەباتەوە!

کۆتایی نامەکەی بە چەند وتەیەکی زانای خوداناس سوفیانی سەوری هێنابوو، کە دەڵێت: (ئەگەر دەتەوێت دنیا بناسیت، بزانە لای کێیە؟!)

(پاشاکان قیامەتیان بۆ جێهێشتوون، ئێوەش دنیایان بۆ جێبهێڵن!)

(ئەگەر یەقین بە خودا لە دڵدا جێگیر بوو، ئەوا بەوپەڕی شادمانیو پەژارەوە دەفڕێت، بە تاسەی شادی بۆ بەهەشتو ترسیش لە دۆزەخ!)

ع.ش. شێرکۆ



# لەگەڵ (ناری)دا

چاوەکەم من بۆیە دایم کارو پیشەم زارییە
حاکمی چاوت لەگەڵ من مایلی غەددارییە
گەر دەپرسی بۆچی بێ نەشئەو مەلولو عاجزی
رووەمەتی زەردم عەزیزم شاهیدی بێ یارییە
دڵ لە شامی پەرچەمی رووتا بە دایم بێ خەوە
چونکە ئێشکچی بە شەودا، عادەتی بێدارییە
حیکمەتی پڕ مەسئەلەی کوڵمت لە بۆ کێ حەل دەبێ
هەر سەحیفە سەد ئیشارەو ڕەمزی تێدا جارییە
خاڵی ڕووخسارت هیدایەت بەخشە، شەرحی زوڵفەکەت
قازی ئاسا حاشییەی ئەگریجەکانت لارییە
ڕووت وەکو ئاتەش، موژەت وەك شیشە، ئەبرۆت قیمەکێش
میروەحەت زوڵفو کەبابت جەرگی پارەی (ناری)یە

ناری ناوی (مەلا کاکە حەمدی بێلو)ەو ساڵی (١٨٧٤)ی زاینی هاتۆتە دنیاو ساڵی (١٩٤٤) لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا دنیای فانی بەجێهێشتووەو لە گوندی (بێلو) لە ناوچەی پێنجوێن بەخاك دەسپێردرێت..

(ناری) مەلایەکی خوێندەوارو ئەدیبێکی گەورە بووەو کەسێکی ڕووخۆشو خۆشمەشرەب بووەو لە شیعرەکانیدا ڕەوانبێژییەکی بەرز بەدیدەکرێت.ڕازێکی بێسنوورو هەستێکی فرە ناسكو دڵێکی سوتاو بەناری عیشقو ئەوین لە شیعرەکانیدا بەڕوونی دەبینرێت.

لەبەر تیری موژەی بێ مروەتی ئەو شۆخە نەخشینە
لە هەرجێ دەنگی یا تەڵقینە، یا یاسینە، یا شینە
لە داخی خارە هەردەم شیوەنی بولبول بەسەر گوڵدا
لەبەر ئەو وەجهەیە شینم، کە ڕووی موحتاجی تاشینە
بە ڕووخۆشی کە فەرموویە دەبێ (ناری) عیادەتکەم
ئەوا مردم لە خۆشیدا لە خۆشی ئەو نەخۆشینە

یاخود دەڵێت:

زوڵفە، یا مارە، لەسەر گەنجی ڕوخت
دووکەڵی ئاهی منە، یا میشکی ناب
نایبرێتۆ دادی من، یا زوڵمی تۆ
غەیری حوکمی مەحکەمەی ڕۆژی حیساب

تا دەڵێت:

قەوسە، یا ئەبرۆیە، یا شمشێری زاڵ
یا کەمانی ڕۆستەمە، پڕ پێچو تاب
بۆ نەبوو ڕەحمت؟ بە حاڵی من دەمێ
تابەکەی چاوم! لە (ناری) ئیجتیناب؟

یا دەڵێت:

مەنعی قەت ناکەم، لە خوێنخۆری کە شێوەی چاوییە
کوشتنو قەتڵی بە ناحەق، کارو پیشەی زوویەتی
نەشتەری غەمزەی لە جەرگم داو بە گریەم پێکەنی
غونچە پشکوتن بە شەونم عادەتی پێشوویەتی

یاخود چ ئەدەبێکی بەرزە دەڵێت:

خاکی دەرگاکەت لە بۆسەر هەروەکو ئەفسەر سەری
ئەلفی باڵاکەت لە پێچو خەم، وەکو عەرعەر عەری
گوڵشەنی ڕووخساری تۆ، ڕەونەقشکێنی نەوبەهار
ئاوێنەی حوسنت لە ڕەنگو ئافەتی سێبەر بەری

شێخانی